
ڕۆڤار
ژمارە ٩٦
هاوینی ٢٠٢٣
ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
سێ مانگ جارێك دەریدەکات
یەکەم ژمارەی ڕۆڤار ٥-٥-١٩٩٩ دەرچووە

سەرۆکی فەخری
شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا
ئازاد بەرزنجی





بەڕێز فاروق مەلامستەفا سپۆنسەریی ئەم ژمارەیەی کردووە

# ژياننامەی مووسا عەنتەر



مووسا عەنتەر: نووسەر، ڕۆژنامەنووس، ڕووناکبیرێکی کوردە و کەسایەتییەکی چالاک بووە، ساڵی ١٩٢٠ لە گوندی تسیپین لەدایکبووە. لە بنەڕەتدا ناوی شێخ شەیحموسە، شێحموس ئەڵماس، "ئەڵماس" ئەو پاشناوە بووە کە دەسەڵاتدارانی تورکیا پێیان داوە، دواتر ناوەکەی کردووە بە مووسا عەنتەر. ڕێکەوتی لەدایکبوونی بەتەواوی نازانرێت، سەرەتا وەک لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٤ تۆمارکراوە، دواتر ساڵی ١٩٢٠، بەڵام دایکی پێی گوتووە تۆ لە دوای فرمانی فلان لەدایک بووی، مەبەستی لە کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکانە. خوێندنی سەرەتایی لە مێردین تەواو کردووە، پاشان قۆناخی ناوەندی و ئامادەیی لە شاری ئەدەنە خوێندووە. لە کاتی خوێندنی ئامادەییدا، یاخیبوونی دێرسم بە سەرۆکایەتی سەید ڕەزا دەستی پێ کرد، ئەمە وایکرد مووسا تووشی ناکۆکی بێت لەگەڵ هاوپۆلەکانی دیکەیدا کە تورک بوون، بەهۆی ئەمەشەوە بۆ ماوەیەکی کەم دەستبەسەر کرا. تا ساڵی ١٩٤١ بۆ خوێندنی یاسا بەرەو ئیستەنبوڵ بەڕێکەوت. لە ماوەی خوێندنی لە زانکۆ زۆرجار لە پشووی هاویندا دەچووە سووریا و لەگەڵ ڕووناکبیرانی ناسیۆنالیستی کوردی وەک: جەلادەت عالی بەدرخان و کامەران بەدرخان، قەدری و ئەکرەم جەمیل پاشا، نووری زازا، نووری دێرسیمی و قەدریجان، ئۆسمان

### ژیانی تایبەتی

مووسا عەنتەر لەگەڵ ئایشە هالەی کچی عەبدولڕەحمان ڕەحیمی هەکاری ڕووناکبیری کورد لە ساڵی ١٩٤٤ هاوسەرگیریان کردووە، هاوسەرەکەی لە نەوەی بەدرخانییەکان بووە. باوکی سێ منداڵە.




### پیشە و چالاکی سیاسیی کوردی

ئاپێ مووسا بە کاری ڕۆژنامەوانیی خۆی چالاکانە پەرەی بە بەکارهێنانی زمانی کوردی دەدا، ئەمەش بووە هۆی گێژاوییەکی زۆر لە ماوەی ژیانیدا. لە ماوەی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەم سێ دەزگای ڕاگەیاندنی دامەزراندووە بە ناوەکانی (Şark Mecmuasi) شارک مەجمواسی لە ساڵی ١٩٥١، (Şark Postasi) شارک پۆستاسی لە ساڵی ١٩٥٤و (Ilery Yurt) ئیلێری یورت لە ساڵی ١٩٥٨. دوای ئەوەی ساڵی ١٩٥٩ شیعری (Qimil) بە زمانی کوردی لە ڕۆژنامەی ئیلەری یورت بڵاو دەکاتەوە، عەنتەر دەستگیر دەکرێت. دەستگیرکردنی ئەو شەپۆلێکی نارەزایی کوردی لێکەوتەوە، کە دوای ئەوە دادگاییکردن لە دژی ٥٠ ڕووناکبیری تری کوردییش دەستی پێ کرد، کە بە کەیسی ٤٩کان ناسراوە. دوای مانەوەی لە زیندان بۆ ماوەیەک، زۆری نەخایاند بەهۆی لێبووردنێکەوە ئازاد کرا. لە ساڵی ١٩٦٣ مووسا عەنتەر و ٢٣ ڕووناکبیری تر دەستبەسەر کران و سزای سێ ساڵ زیندانیان بەسەردا سەپێندرا، گوایە هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردییان داوە. لە ساڵی ١٩٦٤ ئازاد کرا، لە هەڵبژاردنی گشتیی ساڵی ١٩٦٥ وەک بەربژێرێکی سەربەخۆ لە دیاربەکر چووە ناو هەڵبژاردنەوە بەڵام هەڵنەبژێردرا. ساڵی ١٩٦٧ فەرهەنگێکی کوردی بە ناوی (Ferhenga Kurdî) بڵاو دەکاتەوە. لە ساڵی ١٩٧٠ یەکێک بووە لە تۆمەتبارەکانی دادگاییکردنی ئەندامانی









کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات (DDKO) و دوای ئازادکردنی دەچێتە گوندێکی سەر بە قەزای نوسێبین. دوای کودەتاکەی ساڵی ١٩٨٠، ماوەیەکی کەم بە تۆمەتی "پروپاگەندەی کوردی" لە نوسێبین زیندانی کرا. لە حوزەیرانی ١٩٩٠ یەکێک بووە لە ٨١ ئەندامی دامەزرێنەری پارتی کەدی گەل (HEP) و دواتر پاڵپشتی لە دامەزراندنی ناوەندی ڕۆشنبیریی میزۆپۆتامیا لە ساڵی ١٩٩١ و ئینیستیتوتی کوردی لە ئیستەنبووڵ لە ساڵی ١٩٩٢ کردووە.




**تیرۆرکردن**

عەنتەر لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٩٢ کاتێک وەک میوانی فێستیڤاڵی کولتوور و هونەر بانگهێشتی ئامەد کرابوو، لە ڕووداوێکدا خرایە بۆسە و تەقەی لێکرا و کوژرا. ساڵی ٢٠١٢ حەمید یەڵدرم، کە خەڵکی شرناخ بوو، وەک بکوژی ڕاستەوخۆی مووسا عەنتەر، دەستگیر کرا.




**بەرهەمەکانی:**

- برینا رەش – ١٩٥٩
- Kimil - ١٩٦٢
- فەرهەنگا کوردی – ئستانبول، ١٩٦٧
- Hatiralarim، جیلدی ١ – ئستانبول، ١٩٩١
- Hatiralarim، جیلدی ٢ - ئستانبول، ١٩٩٢
- چنارا من - ئەستەمبوڵ، وەشانێن ئاڤەستا
- فرات دەرێژێت مەرمەرە Firat marmaraya akar
- وەقائیمە Vakainame




**ئامادەکردنی ڕۆڤار، بە سوودوەرگرتن لەم سەرچاوەیە: محەمەد ڕزگار، زانیاری، گەورەترین ئینسکۆپیدیای کوردی.**



ڕەنگە ئەوەی من باوەڕێکی عەجیب بێ، چونکە من هەرگیز باوەڕم بەوە نەدەکرد، هیچ مرۆڤێک، گەر خوێنیش بەرچاوی گرتبێ و کاری بەس ئەشکەنجەدانی خەڵکیش بێ، یانیش گەر بکوژی سەدان کەسیش بێ، دەستی بچێتە خونیی کەسانی وەک مووسا عەنتەر.[1]

ئەوکاتەی مووسا عەنتەرم ناسی، تەمەنم نزیکەی بیست و سێ سالێک دەبوو.[2] دۆستایەتیشمان لەوێ ڕۆژێوە تا کۆتاڕۆژی ژیانی هەر بەردەوام بوو. کەسێک بوو، بەردەوام بە ئەرێنی لە دنیای دەنۆڕی. بە شێوەیەک بەردەوام وەک ڕووناکبیرێک، بە ئومێد و باوەڕەوە، لە تاریکترین ڕۆژەکان و زاڵمترین سەردەمەکانی دەڕوانی. لە خراپترین مرۆڤدا، بە دوای لایەنێکی باشیدا دەگەڕا، دوای دۆزینەوەی ئەو لایەنە چاکەی، هەوڵی دەدا لەو ڕێیەوە ئەو کەسەی خۆشبوێ و لێی تێبگات. لە کۆتایی تاریکترین تولەڕێگەکانی ژیان، تیشکێکی رووناکی دەبینیەوە، لە پەرێشناترین دۆخدا، بە ئومێدەکانییەوە هەناسەیەکی بەبەر هەموانەوە دەکرد.

ئەو لەو کەسانە بوو، سەرباری ئەو هەموو زوڵم و تاوان و ناخۆشیی و سووکایەتیپێکردنەی دەرحەقی کرابوو، هەرگیز خۆی ڕادەستی ئەو تاوانانە نەکردبوو. ئەو بە هەموو مانایەک، هەڵگری وزەی ڕادەستنەبوون و سەرشۆڕنەکردن و شەرەف بوو. قەداسەتی کەسایەتیی ئەو، لەو شەرەفەوە سەرچاوەی دەگرت، کە هەرگیز ملکەچی قبوڵ نەکردووە. ئەو باوەڕی بە فەرهەنگی گەلەکەی بوو. وەک چۆن باوەڕی بەوە بوو، ئەو کولتوورە ڕۆژێک سوود بە فەرهەنگی هەموو گەلانی جیهان دەگەیێ. مووسا عەنتەر هیچ کات، نەبووە نەژادپەرست، چونکە ئەو، نەتەوەپەروەری و نەژادپەرستی تێکەڵ بەیەک نەکرد. بۆیەش هەر بە کەسێکی سۆسیالیست و دیموکرات ماوە. (ئاپێ مووسا) کە کورد ئاوا ناویان دەهێنا، کەسێکی زۆر نەرم و خۆش مەشرەب و میهرەبان بوو. بە نەرمترین شێوە، وەڵامی ڕەقترین قسە و هەڵسەوکەوتەکانی دەداوە. هەندێکجار نەبێ، ئەویش زۆر بە کەمی، تووڕەییەکەی سنووری نەرمییەکەی تێدەپەڕاند. وەک چۆن بە عینادەوە، تا کۆتایی تەمەنی

---

1 مووسا عەنتەر یان ئاپێ مووسا (١٩٢٠-١٩٩٢) نووسەر و ڕۆژنامەڤانێکی کوردی شاری مێردینی باکووری کوردستانە. بەهۆی نووسین و پەرتووک و هەڵوێست و ڕەخنەکانی لە دەوڵەتی تورکیا، بەرانبەر بە بەرگریکردن لە گەلی کورد و زمانەکەی، ساڵەهای ساڵ کەوتووەتە زیندان. خاوەن چەندان پەرتووکی گرنگە بە زمانی کوردی شێوەزاری کرمانجی و زمانی تورکی. پەرتووکی (بیرەوەریەکانم) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی شێوەزاری سۆرانی. ساڵی ١٩٩٢ دەستێکی ڕەشی نادیار، کە تا ئێستا دادگاکانی تورکیا ساغیان نەکردووەتەوە بە فەرمی کێ بووە، لە کوچەیەکی تاریکی دیاربەکر، لە پشتڕا مووسا عەنتەر شەهید دەکا. (وەرگێڕ).

2 ڕۆژێک لە ئیستانبوڵ، کاتێک مووسا عەنتەر لە ناوچەی فلۆریا لە قەراغ دەریا مەلەی دەکرد؛ گوێی لە دەنگی فیکەیەکی کوردی دەبێت، کە لە زاری گەنجێکەوە لێ دەدرێت. مووسا عەنتەر لە ئاوەکە دێتە دەرێ و دەچێتە لای و هەندێک پرسیاری لێ دەکات، وەلێ گەنجەکە زۆر بە عەکسی وەڵامی دەداتەوە، بەڵام ئاپێ مووسا بەر لە ڕۆیشتنی کارتی ناونیشانی خۆی دەداتێ. دوای چەند ڕۆژێک گەنجەکە لە بەشە ناوخۆیی دەچێتە لای. سەرەتا دەرگاوانەکە ناهێڵێ بچێتە ژوورەوە، بەڵام ئاپێ مووسا گوێی لە دەنگە دەنگەکە دەبێ و دەچێ گەنجەکە دەباتە ژوورەکەی و دەست بە دەمەتەقێ دەکەن. لە کاتی ڕۆیشتنی مووسا عەنتەر دەیەوێ هەندێک پارە بۆ خەرجی بداتە گەنجەکە، بەڵام ئەو ڕەتی دەکاتەوە و دەڵێ: "هاتوومە ئێرە تا تۆ ببینم، نەک پارەکەت". ئەو گەنجە یاشار کەمال بوو. (وەرگێڕ).

پەیوەست بوو بە بیروباوەڕەکانییەوە. مووسا عەنتەر بە گۆشت و خوێن و هێسکی خۆی، دژی لەناوبردنی ناسنامە و کولتوورەکەی وەستاوە. بۆ ئەمەش جەنگەکەی، بەبێ برانەوە، تا مردنی درێژەی پێدا. ئاخر هەر بۆیەش کوژرا. وەلێ ئاپێ مووسا بە دڵخۆشییەوە مرد. چونکە کۆتایی جەنگەکەی نەبینی، وەلێ گزنگی ڕووناکیەکانی بینی. ئەها پێشتریش گوتم، ئەو خودی خۆی بوو، کە تیشکی ڕووناهی دوای هەموو تاریکییەک، جا تاریکییەکی حەفت پشتیش دەبینی.

ئەوانەی ئەویان کوشت، ئەوانەی ئەویان بە کوشتندا، هیچ کارێکی چاکیان نەکرد. ئەوانەی ئەویان کوشت و ئەوانەی بە کوشتنیان دا، دەستیان چووە بینەقاقای تورکیاش. وەک ئەوەی هەڵیانکوتایە سەر شرناخ و لەگەڵ عەرز کردیانە یەک. وەک ئەوەی ناوچەی گۆلەیان، کردە گۆلی خوێن. وەک ئەوەی ناوچەی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵیان کردە گۆلی خوێن. ئەوانە زۆر خراپە لەگەڵ تورکیا دەکەن. یانی تێکۆشە لەناو خوێنی تورکیا دەکەن. نەدەبوو هەڵکوتنە سەر شارێکی تورکیای خاوەن بیست هەزار کەسی. ئەو کارە، ڕێک هەمان کاری ئەو دیکتاتۆرانەیە، کە لە وڵاتدا بە ملیۆنان کەس دەکوژن، لەپێناو زەبتکردنی دەسەڵاتەکەیان. نەدەبوو تورکیا بخەنە سەر ئەو ڕێگەیە. ئاخر لەگەڵ چوونمان بۆ سەدەی بیستویەک، نەدەبوو ئەو لەکەیە بە نێوچاوانمانەوە بنرێ. بۆیە لە سەردەمێکی وەها مرۆڤ دۆستدا، جیهانیش کارێکی وەها دژ بە مرۆڤایەتی قبووڵ ناکات و هیچ کاتیش لێی خۆشنابێت.

تورکیا و مرۆڤایەتی لە کوشتنی کەسێکی وەک مووسا عەنتەری کۆتری ئاشتی خۆشنابێت. ئاخر دوای ئەو هەموو زوڵم و ستەم و ڕشتنی ئەو هەموو خوێنە، چۆن لەگەڵ یەک ئاشت دەبنەوە؟ بۆیە دەڵێم هاوار و سەت هاوار، تا درەنگ نەبووە، تا هەموو شتێک لەوە خراپتر نەبووە، ئاخر لەبەر خوێنی مووسا عەنتەر و ئەوانەی وەک ئەون، لەپێناو خۆشەویستی برایەتییەکی هەزار ساڵە، لەپێناو ئومێدی جوانیی و تەبایی و برایەتی داهاتوو، با کۆتایی بە وەها کارێک بهێنین. ئاخر ڕێککەوتنی نێوان کورد و تورک کارێکی وەها قورس و تاقەتپڕووکێن نییە. بۆیە ئەوەی گەلی کورد و گەلی تورکی خستە سەر ڕێگەیەکی وەها تەنگەبەر، دەنگ و ویستی ستەمکارە کۆنەکانی حەفتا ساڵی ڕابردووبوون. **ئەوەی ئەم بەڵایەشی ئەمڕۆ بەسەردا کردینەوە، پاشماوەی ئەو ستەمکارە بێ ئینسافانەی حەفتا** ساڵی ڕابردوون.

**بە لێبووردەییەوە لە خاکی ئەنادۆڵ بڕوانن، چونکە خاکێکی بە پیت و پڕ بەرەکەتە بۆ برایەتی و جیاوازی پێکهاتەکان و گەشەسەندن و باڵاکردنی دیموکراسی. بۆیە نەکەن کەرایەتی بتانگرێ و دەستتان بچێتە لەناوبردنی کولتوورە جیاوازەکانی ئەو خاکە و لێبووردەکەییەوە.**






بەردەوام دەپرسن، ئاخۆ کورد چی دەوێت؟ من وەڵامی ئەو پرسیارە باش دەزانم. دەزانم مووسا عەنتەرەکان چیان دەوێت؟ دەزانم گەلی کورد چی دەوێت؟ ئیدی ئەوان لەو سەردەمەدا شتێکی زۆریان ناوێت. ئەوان زمانی خۆیان دەوێت. کەچی هەندێک هەنە دەڵێن، ئەدی ئەوە نییە بە زمانی خۆیان دەپەیڤن! دەپەیڤن ها!... ئەی ژەنەڕاڵە

سەربازییەکان ئەو زمانەیان قەدەغە نەکردبوو، ها! جا ژەنەڕاڵە نیشتیمانپەروەرەکان...

داواکردنی زمان، بە مانای قسەکردن بەو زمانە نایەت. بوونی زمانی گەلێک، تەنیا بە ئاخافتن بەو زمانە کۆتایی نایەت. چونکە ئەو زمانە، دەبێ ئەدەبیاتی نووسین و پەیڤینیشی هەبێ. لە هەموو سەردەمەکانی عوسمانییەکانەوە تاوەکو دامەزراندنی کۆمار، کورد، هەم ئەدەبیاتی نووسراوی هەبووە، هەمیش گوتراو. گەلێک بۆ هەبوونی زمانەکەی، دەبێ لە قوتابخانە و سیستەمەی پەروەردەیی زمانەکە بخوێندرێ، لە قۆناخی سەرەتاییەوە تاوەکو زانکۆ. وەک چۆن دەبێ بەو زمانە ئەکادیمیا و پەیمانگە و دامەزراوە زمانەوانییەکانیش هەبێ.




گەر بێینە سەر زمانی کوردییش، بە دڵنیاییەوە لە ڕابردوو، کورد زۆر ناوداری پێشکە و تو و ی هەبووە لە ئەدەبیاتی نووسراودا. وەک چۆن زۆر شاعیری ناوداری جیهانی هەبووە. ئەحمەدی خانی گەورە شاعیری سەدەی 16، یەکێکە لەوانە. بەر لە ئەویش، مەلای جزیری لە سەدەی 12، فەقێی تەیران. ئەوانە شاعیری زۆر گەورەی دیوان بوونە و بەردەوامیش شیعرەکانیان بە کوردی نووسیوە. فەقێی تەیران بە درێژایی ژیانی، هەرچی شیعری نووسیبێت، پێشکەشی چۆلەکە و باڵندەکانی کردووە و شیعری لەبارەوە نووسیون. جا تەواوی ئەو شاعیرانەی ناوم هێنان، گۆڕەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ وەکوو مەزاری ئەولیا و پێغەمبەرەکان، خەڵک سەردانیان دەکەن. بە شێوەیەک ساڵانە سەدان هەزار کەس دەچنە سەر گۆڕەکانیان و لەوێ قوربانییان بۆ دەکەن.

وەک ئەدەبیاتی نووسراویش، کورد، وێژەی گوتراویشیان زۆر دەوڵەمەندە. بۆ نموونە دەنگبێژی داستان لە دنیادا، تا ئێستا تەنیا لەناو دوو گەلدا ماوەتەوە، ئەوانیش: یەکێکیان گەلی کوردە و ئەوەی دیکەش قرگزەکانن. جگە لەمانە، گۆرانییە کوردییەکان و حەیران و لاوانەوە و لاوک و سەردوولکە و حیکایەت و چیرۆکە کوردییەکان فرە زەنگینە... بەشێوەیەک فۆلکلۆری کوردی بەقەد فۆلکلۆری تورکی دەوڵەمەندە.

جیهان وەک باخچەیەکی هەزار گوڵی کولتوورییە. هەر گوڵە و ڕەنگ و شێواز و بۆنێکی تایبەتی هەیە. گەر هات و یەکێک لەو گوڵانە، لەو باخچەیە کەم بووەوە، فەرهەنگی مرۆڤایەتی، ڕەنگ و بۆن و شێوازێک لەدەست دەدا. گەر هات و 100 دانە لەدەست بدات، فەرهەنگی مرۆڤایەتی هەژار دەبێ. کولتوورەکان تا هاتنی ئەمپریالیزم، بەردەوام یەکدییان ڕەنگ و بۆ دەکرد و لە هەوڵی دەوڵەمەندکردن و پێشکەوتنی هەڤدوو دابوون.

گەر لە حەفتا ساڵی ڕابردوو، ڕێگە بە زمان و کولتووری کوردی درابا، لەبەر ئەوەی ئەو دوو فەرهەنگە لەسەر ئەو خاکە گەش و نمایان کردووە، بەهۆی ئەوەی هەمان هەوا و ئۆکسجینییان هەڵمژتووە، یەکدییان بەخێو دەکرد.

جا بە بۆچوونی ئێوەیش زیاتر پێشنەدەکەوتن؟ ئاخۆ خاکی ئەنادۆڵیش، نەدەبووە تاقە نیشتیمانی کولتوورەکان؟ فەرهەنگی کوردی لە ماوەی حەفتا ساڵدا، ڕەنگبوو چەندان کەسایەتی وەکو نازم حیکمەت[3] و سەعید فایەق و ئۆرهان وەلی و ئەحمەد عارف[4] و مەلیح جەودەت و فەتحی ناجی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردبا. جا بەو شێوەیە بوونی کولتوورێکی دیکە بۆ ئەنادۆڵی، شتێکی خراپ دەبوو؟ "تورک وەک پێویست، جگە لە مستەفا کەمال ئەتاتورک، چ گرنگیان بە فەرهەنگی نەتەوەیی تورک و زمانەکەی دا؟" ستەم و داپڵۆسینی حەفتا ساڵ، وەک باگوردان بەسەر فەهەنگی تورکیدا چوو، وەلێ نەیتوانی لەباری ببا؛ دەزانن بۆ؟ ئاخر وەک چۆن زمان و فەرهەنگی کوردی قەدەغەکرا، ئەو هێزە داپڵۆسێنەرانە لە دەستیان نەهات هەمان ئەو قەدەغەکارییانە، بەسەر کولتووری گەلی تورکیدا جێبەجێ بکەن، لەبەر ئەوە لەنێو نەچوو.

لەو باوەڕەدام لە دنیادا، هیچ گەلی دیکە نین، وەک نەتەوەی کورد و تورک هەزار ساڵ بەیەکەوە وەک برایان ژیابن و لە شێوەی گۆشت و نینۆک، چووبنە ناو یەک. ئەی گەر وایە، ئەم شەڕ و کۆڵەمستانییە لە پای چی؟

بە بۆچوونی من، لە کێشەیەکی دیموکراسی بەولاوە هیچ ئاریشەیەکی دیکە نییە. وەک چۆن، هەندێکیش کێشەیەکی نەژادپەرستییە. وەک چۆن کێشەیەکی خۆویستیی و نەخوێندنەوەی دەوروبەر و پێشهاتەکانی هەنووکەی جیهانە.

کورد مافە مرۆڤایەتییەکانی دەوێ. زمانەکەی خۆی گەرەکە، داوای فەرهەنگی خۆی دەکات. لەگەڵ ئەمانەش، بۆ ناوچەکانی **ڕۆژهەڵات داوای** یەک لە دەی ئەو **گرنگیپێدانە ئابوورییە دەکات،** کە حکومەت دەیداتە **شارەکانی ڕۆژئاوای تورکیا.** چونکە کورد دەڵێن، **ئەی ئێرەش خاکی نیشتیمان** نییە. دۆستان و **نیشتیمانپەروەران، ئێستا** بە تەواوی بۆتان ڕوون بۆوە، ئەو شتانەی کورد داوای دەکات چین؟ ئاخۆ ئەو داواکارییانە دەبیستن؟ کورد نایانەوێت ئەو نیشتیمانە پارچە پارچە بکەن؛ ئەوەشتان باش باش و بە تەواوی بۆ ڕۆشن بوو؟



دەمەوێ ئەو گوتن و نووسینانەی خوارەوەم، هەموو کەسێک بیزانێ و بیکەنە گوارەیەک و لە گوێی خۆتانی بکەن: مرۆڤایەتی بە زانست و زانینێکی زۆرەوە بەرەو سەدەی بیستویەکەم هەنگاو دەنێ. ئیدی مرۆڤایەتی گەیشتە ئەو باوەڕەی، جیهان باخچەیەکی هەزار و یەک گوڵی ڕەنگاوڕەنگە. هەست و زانینیش، دژی لەناوبردنی هەر کولتوورێکی ئەو جیهانە، بەرەو ڕێکخراوەیی

3 نازم حیکمەت (١٩٠٢-١٩٦٣) شاعیری ناوداری تورک، شیعرەکانی بۆ سەر چەندان زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراوە. بەهۆی بۆچوونە سیاسیەکانییەوە لە تورکیا پەناهەندە دەبێ. یەکێکە لەو کەسایەتییانەی لەگەڵ ماڵباتی بەدرخانییەکان نزیک بووە. وەکو کەسایەتییش لە زۆر بۆنە و نووسیندا، بەرگری لە مافەکانی گەلی کورد کردووە لە تورکیا. (وەرگێڕ).

4 ئەحمەد عارف حیکمەت ئۆنال (١٩٢٧-١٩٩١). لە دیاربەکر گەورەبووە و خوێندنی سەرەتایی لە شارۆچکەی سوێرەک دەست پێ کردووە و قۆناغی ناوەندیی لە شاری رووها تەواو کردووە. بەشی فەلسەفەی زانکۆی ئەنقەرەی خوێندووە، لێ بەهۆی جموجۆڵی سیاسیی و زیندانکردنی، خوێندنی پێ تەواو نەکراوە. ساڵی ١٩٥٠ دەگیرێت و دوو ساڵ زیندانی دەکرێت. بەرهەم و شیعرەکانی ئەحمەد عارف ئەگەرچی بە زمان تورکین، بەڵام بە هەستی کوردانە هۆنراونەتەوە و ژان و ناسۆری کوردەواریی پێوە دیارە. شیعرەکانی شاعیر بە تورکی، لە ساڵانی ١٩٤٠-١٩٥٥ لە گۆڤارەکانی ئەوسا دێنە وەشاندن. هەندێک لە هەڵبەستەکانی لەلایەن هونەرمەندی کورد، ئەحمەد کایا کراوەتە گۆرانی. ئەحمەد عارف شاعیرێکی هەست ناسک و عاشق بووە و نامە دڵدارییەکانی بۆ لەیلا ئەربیل، گەواهیدەری ئەو هەستەی شاعیرن. (وەرگێڕ).



بوون هەنگاو دەنێ. وەک چۆن مرۆڤایەتی گەیشتە ئەو باوەڕەی، پاراستنی ئەو سروشتەی هەمانە، یەکێکە لە گرەوەکانی لە پێشینەی ژیانمان، بە هەمان شێوەش، مرۆڤایەتی دەمێکە گەیشتووەتە ئەو باوەڕەی، پاراستنی فەرهەنگ و ڕەنگەکانیش هەمان گرۆی ژیانکردنمانە. بۆ ئەمەش جەنگێکی بەردەوام لەپێناو مانەوەی کولتوورەکان دەکا.

بۆیە لەمەودوا، مرۆڤایەتی ڕێگە بە لەناوبردنی هیچ زمان و کولتوورێک نادا لە جیهان. ئەمڕۆ مرۆڤایەتی، بە هەر شێوەیەک بێت، لە پاڵ فەرهەنگی گەلی کوردی بریندار و ستەملێکراوە و جەنگی پاراستنی دەکا. ئەو جەنگەش بۆ پاراستنی کولتووری کوردی، تا دێ گەورەتر دەبێ. مرۆڤایەتی ناهێڵێت ئەو گوڵانەی لە ئەزەلەوە هاتوونەتە بوون، وردوخاش و هەنجن بە هەنجن بکرێن. جا هیچ هێزێکی ناو ئەو بەیەکدادانەش، ناتوانێ بە پێش ویستی مرۆڤایەتی بکەوێت.

دەمەوێ شتێکی دیکەش بپرسم: دەڵێم گەر هاتوو زمانی کوردی بە گەلی کورد بدەینەوە و هاوکار بین لە پێشخستنی فەرهەنگی کوردی، ئاخۆ چ شتێک زەرەر دەکەین؟ ئاخر لە تەواوی سەردەمی عوسمانییەکانەوە چیمان زیان کرد! بە پێچەوانەوە، پێم وایە فەرهەنگەکەمان قازانجی زیاتر دەکا.

جیا لە مانە، کێشەیەکیش هەیە بە ناوی ئاپۆ. دەڵێن تا ئاپۆ ئاگربەست ڕانەگەیەنێت، ئێمە مافە دیموکراتییەکان بە کورد نادەین؛ ئاخر نەک قەلەڕەش، بەڵکو چۆلەکەیەکیش، پێکەنینی بەو هزر و بیر و لۆژیکە دێ. ئێ دیموکراسیمان چ پەیوەندییەکی بە ئاپۆوە هەیە؟ یان هەر لەبەر ئەوەیە کە کورد، مافە مرۆڤایەتی و کولتوورییەکانی خۆی دەوێت؟ ئەی ئێوە نازانن، تورکیا یەکێکە لەو وڵاتانەی، لە چەند ڕێککەوتنێک بترازێت، هەموو ڕێککەوتنە جیهانییەکانی مافی مرۆڤی واژوو کردووە. ئێ لەوێ خۆ هیچ ماددەیەک نییە بەناوی ئاپۆ؟ ئەی خودایە گیان، ئەو گۆتنانە، چەند شتێکی نامەعقوڵ دوور لە ئاوەزە.

جا جیا لەهەموو ئەمانە، دەڵێن گەر سەرجەم مافە مرۆڤایەتییەکان بە کورد بدەین، ئینجا داوای جیابوونەوە دەکەن. یانی ئێستا بەر لەوەی ئەو مافانەشیان بدەنێ، کورد ئەو داوایەتان لێ ناکەن؟ ئەی بەو شێوەیە، ئێوە خۆتان بۆ وەها داواکارییەک نایانکەنە خاوەن حەق و ماف بەرانبەر مرۆڤایەتی؟ جا گەر وەها بێت، تەواوی مرۆڤایەتی لە پاڵ گەلی کورد نابێت؟

ئەی کوانێ، ئەو قسەیەی دەیگوت، بە ڕاستی کوردمان ناسیوە؟ ناسین بەو شێوەیە دەبێ؟ یان بەو شێوەیە دەبێ کە وڵات خەڵتانی خوێن بکەن؟ یانیش تەنیا بە ئەشکەنجە و زوڵم و ستەملێکردن و دروستکردنی جەهەنەمێک لەو وڵاتە بۆیان، حەقیقەتی کورد دەناسن؟ ئێمە ناچارین ئەم گۆلە خوێنە وشک بکەین، بە بڕینی شادەمارەکانی...

جا مەپرسن چۆن؟ گەر دەشپرسن با پێتان بڵێم.

دەبێ لەسەر مێز بە دانیشتن و ئاخافتن چارە بکرێ.

لەگەڵ کێ؟

لەگەڵ کورد

لەگەڵ کامە کورد؟

ئەوە پرسیارێکی تەکنیکی زۆر ئاسانە. لەگەڵ هەموو کەسێک، بە هەڵبژاردنی نوێنەر لە هەموو ناوچە کوردییەکان... من چوزانم... بەڵام لەناو 15 ملیۆن مرۆڤی بەهێز، دەستەیەکی تەندروست بەردەوام هەر هەیە و دەدۆزرێتەوە تا نوێنەرایەتی ئەو گەلە بکات، گەر تۆزێکیش بە دواییدا بگەڕێن، هەر لەو نزیکانە دەیاندۆزنەوە. سەیرکەن با پێتان بڵێم، گەر هاتوو مووسا عەنتەر نەکوژرابا، ئەو ئاشتییەی باسی دەکەم، زۆر ئاسانتر دەهاتە بوون. یانی بە شێوەیەک، ویژدانی ئەو لەسەر مێزی گفتوگۆ دەیتوانی نوێنەرایەتی کورد و تورکیش بکات.

وەک ئەوەی برادەرانی ڕۆژنامەوان دەیڵێن، گەر ئەو ڕێکخراوەی لەژێر چەتری پاراستنی حکومەتدایە، هەوڵی کوشتنیان نەدەن، لە تورکیا زۆر مرۆڤی ماقووڵ هەیە کە توانای ئاشتکردنەوەی کورد و تورکی هەیە. بۆیە گەر دەست و بردێک لەو باسە بکەین، کارێکی چاک دەبێ.

لەگەڵ تێپەڕینی هەر ڕۆژێک، ئەو جەنگە پیس و نەگریس و بێ مانایە، بۆ ئێمە زیاتر دەکەوێ. تاقیکردنەوەی شەڕی گەریلاش ئەوەی پێگوتین، وەک ئەو تاقیکردنەوانەی جیهان هەروا ئاسان تەواو نابێ؛ هەر تەوایش نابێ... جیا لەمانە، کۆمەڵکوژی و قڕکردن هەیە، وەک ئەو عاقڵانەی پێشتر پێشنیازییان کردبوو، وەک ئەوانەی گوتیان درەخت لە چیای جودی تەواو نابێ، وەک هەڵسوکەوتی ئەوانەی، گوتیان ڕووداوەکانی شرناخ دەستپێکێکە.

هیچ لایەن و کەسێک توانای ئەوەی نییە 15 ملیۆن کورد لەناو ببا. وەک چۆن ناتوانرێ، مافی مرۆڤی 15 ملیۆن کوردییش نەدرێت. ئەو گەلەی ویستی وەرگرتنی مافی ناسنامەی خۆی، لە دڵیدا مۆر کردبێ، بە هیچ شێوەیەک، بە هیچ ترساندنێک، بە هیچ زوڵمێک، هەتا بە کوشتنیش ناتواندرێ ئەو ویستە مۆرکراوەی ناو دڵی پاک بکرێتەوە.

براینە، نیشتیمان دۆستینە، چەپینە، پارێزگارینە، هەرچی لایەنی دیکەنە، قوربانی چاوتان بم، ئەو بەڵایە لە لایەن دەسەڵاتدارانی **حەفتا ساڵی** ڕابردوو هەڵگیرسێندرا. دۆخەکەش زۆر **بەرەو** خراپی دەڕوا، گەر بڵێم چەند ساڵی **دیکە چیمان** بەسەردێ، جا لە چەند **ساڵێکی کورتیشدا گەر بڵێم** چیمان بەسەردێ، **دڵنیام چەند کەسێکی** دڵڕەشی زارشڕی خراپ، **پەیدا دەبن** و دەڵێن ئەها ئەوە هەڕەشەمان لێدەکات.



براینە وەرن با هەموومان، ببینە یەک. ئەو مافە نەتەوەیی و ئینسانیانەی کورد، ئاخروئۆخری، هەر لەدەستمان دەری دەهێنن، وەرن با ئێمە خۆمان بە خۆشەویستییەوە ئەو مافانەیان پێ بدەین. با لەوە زیاتر، ئەو برایانەمان لەو مافەیان بێبەش نەکەین. ئاخر غەدرە، چوونکە ئەوان برایەکی هەزار ساڵەمانن، ئەی وا نییە؟

وەرن با بەو دەستە خوێناویانەمانەوە نەچینە ناو سەدەی بیستویەک، با بە کوشتدانی برایەکان دژ بەیەک، نەچینە ناو سەدەی



بیستویەکەوە. با بە لەکەیەکی ڕەشی سواقدراو بە خوێنی براکانمانەوە، نەچینە ناو سەدەی بیست و یەکەمەوە. با سەرشۆڕن نەبین بەرانبەر مرۆڤایەتی. ئاخر لە سەدەی بیستویەکدا، مرۆڤایەتی زیاتر لە مافە ئینسانییەکان و کولتووری مرۆڤایەتی ورد دەبنەوە. ئاخر دنیا زۆر بچووک بووەتەوە. ئیدی ئەو ماف و حەقە مرۆڤانییەی گەلان، کە لێرە خراوەتە ژێر پێیان، لەو سەری دنیاوە لێتان دەپرسنەوە.

لەم سەردەمەدا، بەڕێوەبردنی حکومەت لە ڕێگەی دیموکراسییەوە، گەورەترین شەرەف و شانازی وڵاتە. بۆیە گەر هات و مافە ئینسانییەکانی 15 ملیۆن کەس نەدەن، چۆن دەتوانن پایەکانی دیموکراسی بخەنە بواری کردارەکی؟

ئیدی مرۆڤایەتی نالێ "یان سەردەستی دەوڵەت، یانیش مەرگ و بەس". خۆش ئەوەیە، ناشتوانێ شتێکی وەها بڵێت، وەک چۆن ئەو دروشمە بە کەسیش نادەنە گوتن.

دەڵێم ئاخۆ، هەر بەڕاستی ئێمە دەتوانین بەقەد مووسا عەنتەر نیشتیمانەکەی خۆمان خۆشبوێت؟ یانیش دیموکراسی وەها خۆشەویست دەبێ لەلامان؟

دڵنیام لەو تولەڕێیە تاریکە ڕزگارمان دەبێ، چونکە من زۆر باوەڕ و سیقەم بە مووسا عەنتەرەکانی ئەو نیشتیمانە هەیە. جا کورد بێ یان تورک، یان هەر نەتەوەیەکی دیکە. بۆیە دەڵێم هەر بژین مووسا عەنتەرەکان و ئاپێ مووساییەکان.

**مانگی نۆی ساڵی 1992**

**سەرچاوە:**

Yaşar kemal, Bu bir çağrıdır, yapı kredi yayınları 2012

# ئاشنابوون بە بەژنێك كە هەرگیز بزر نابێت و بەردەوام لێمانەوە دیارە

مووسا عەنتەر

"1918-1992"

چنارە بەژن زراڤەكە



سیروان ڕەحیم

مرۆڤ چییە، کاتێک زۆربەی ژیانی، تەنها بریتی بێت لە خواردن و خەوتن، ئەوە ئاژەڵێکە و هیچی دیکە نییە.
ویلییەم شێکسپیر (1564-1616) شاعیر و شانۆکاری بەنێوبانگی ئینگلیز.

**دەستپێک:**

ڕۆماننووسی ناودار یاشار کەمال (1923) سەبارەت بە کوشتنی مووسا عەنتەر دەڵێت:
«کەسێک هەرچەندە بێویژدان و هەرچەندە ئەشکەنجەکارێکی دڕندەیش بێت، پێم وانییە بتوانێت مرۆڤێکی وەکو مووسا عەنتەر بکوژێت. ئەوە چ هۆڤێکە دەتوانێت و لە دەستی دێت ئەو پیاوە بکوژێت؟".
ئاخر یاشار کەمال کەسێکە لەوانەی زۆر باش و لە نزیکەوە مووسا عەنتەری دەناسی، کاتێک ئەو نووسەرە، واتە یاشار کەمال بە ئاوارەیی دێتە ئیستانبوڵ، مووسا عەنتەر دەبێت بە پشتوپەنای. عەنتەر دەبێت بە چاوساغی ئەو پیاوە ئاوارەیە، پیاوێک کە ئەو دەمە کەس نەیزانیوە هەڵگری چ بەها و بەهرەیەکە. بەڵام پەسنێکی مووسا عەنتەر هەیە بۆ یاشار کەمال، کە یەکێکە لە ڕستە جوانەکانی ئەدەبیات. پەسنێکی وی بۆ «فیکە»لێدانی یاشار کەمال. ئەو دەمەی یەکەمجار مووسا عەنتەر یاشار کەمال دەبینێت، ئەو بینینەی دەبێت بەهۆی یەکترناسینیان، کاتێک لە ئیستانبوڵ گوێی لە «فیکە»ی ئەو مرۆڤە ئاوارەیە دەبێت. مووسا عەنتەر دەنووسێت: کاتێک بینیم زانیم ئاوارەیە و دەیەوێت شوێنێک بۆ خۆی لەو شارە جەنجاڵە وەدەست بخات، بەڵام کە هاتە گۆ بە تورکی قسەی لەگەڵ کردم. من پێم گوت تۆ ڕیتم و ئاوازی «فیکە»کەت کوردییە، تۆ کوردی، بۆچ بە تورکی قسە دەکەیت؟ چ پەسنێکی تایبەت و نایابە، کاتێک مرۆڤ لە ڕێی بیستنی فیکەوە هەست بکات بەرانبەرەکەی کوردە. بێگومان بە گەڕانەوە بۆ ئەو ڕەوشەی کە لەو کاتەدا زمانی کوردی تێدا قەدەغەکراوە و بەردەوام هەوڵی لەناوبردنی زمانەکە هەیە، نرخی ئەو پەسندانی فیکەیە لە لایەن مووسا عەنتەرەوە ڕوونتر دەردەکەوێت. ڕوونتر دەردەکەوێت لە چ هەستێکی تایبەتەوە سەرچاوە دەگرێت.

**سەبارەت بە مووسا عەنتەر:**

کەم، زۆر کەم لە لای ئێمە سەبارەت بە مووسا عەنتەر نووسراوە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەو ناوە نا ئاشنایە دەبێت ئاشنا بین پێی. دەبوو زووتر بماناسیبا و زۆرمان لەسەر بنووسیبایە. بەڵام بە داخەوە کە شتێکی ئەوتۆ لە لای ئێمە لەسەر عەنتەری نووسەر، ڕۆژنامەوان و لەوانەیش گرنگتر خاوەن شێوازی ئیرۆنی لە نووسیندا، نەنووسراوە. بە هیوام ئەم نووسینە هەنگاوی سەرەتا بێت و زۆر بەرهەم بەدووی خۆیدا بێنێت. ئیتر نووسین بێت سەبارەت بە عەنتەر، یان وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بێت. بە تایبەتی شانۆنامە و بیرەوەرییەکانی.1 مووسا عەنتەر کەسێکە نەک زۆربەی ژیانی بە خواردن و خەوتن بەسەر نەبرد، بەڵکو وەکو مرۆڤێکی ئاساییش ژیانی خۆی نەژیا و لە لایەن دەوڵەتی تورکەوە ناچار کرا زۆر کاتی زێڕینی خۆی بە زیندان ببەخشێت. گەلۆ کۆماری تورکیا لە تەمەنی خۆیدا، چەند مرۆڤی وەکو مووسا عەنتەری بەو دەردە بردووە؟ ڕەوشێکە مایەی لەسەر وەستان و چێکردنی لێکۆڵینەوەی یاسایی.

1 پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، ئەم وتارەکەی بەڕێز «سیروان ڕەحیم» بەر لە وەرگێڕانی «بیرەوەرییەکانم» و شانۆنامەی «برینا ڕەش» بۆ سەر زمانی کوردی، نووسراوە. (ڕۆڤار)

مووسا عەنتەر، یان وەکو ناوە گەلێرییەکەی «ئاپێ مووسا»، تا ئەو ڕۆژەی لە ١٩٩٢/٩/٢٠دا گرووپێک بکوژی نادیار کوشتیان، هەمیشە چالاک و دەم بە کەن بووە. پیاوێک بوو بەردەوام لە ناو ئەندێشە و غەمدا. ئەو هەمیشە بیری دەکردەوە و ڕادەما. بەردەوام پرسیاری دەکرد بۆ کورد نابن بە هیچ؟ «بە هیچ نەبوونی کورد» غەمی گەورەی ئەو بوو، غەمێک بە بێدەنگی، بەڵام بە سەختی هەناوی دەخواردەوە.

ڕاگەیاندن وەهای بڵاو کردەوە: «گرووپێک بکوژی نادیار کوشتیان»، بەڵام ڕاستییەکەی بکوژانی عەنتەر نادیار نەبوون، چونکە لە پشتی دەزگا ترسناکەکانی دەوڵەتەوە خۆیان مەڵاس دابوو. هێزێک بوون کۆڵانە ترسناک و تاریکەکانی دەوڵەت سەرچاوەی وزەیان بوون. مووسا عەنتەر بوو بە قوربانی دەستی «ژیتەم»[*]، ئەو هێزە بێ ئامانەی کە یەکێک لە دامەزراوە ترسناکەکانی دەوڵەتی قوڵە[**]. لەو ساڵانەدا لە پای نەهێشتنی بزاڤی کورد و بێ دەنگکردنی هاوارە زۆرەکان، ژیتەم بە شێوەیەکی ورد پلانی کوشتنی کۆمەڵێ کەسایەتی و ڕۆشنبیری کوردی داڕشتبوو، مووسا عەنتەر یەکێک بوو لەو کەسانە.

یەکێک لەو گرووپانەی کوشتن کە سەر بە ژیتەم بوون، لە ڕۆژی ١٩٩٢/٩/٢٠دا، لە شاری ئامەد «دیاربەکر» مووسا عەنتەر دەخەنە داوی خۆیانەوە و پاشان دەیکوژن. بێگومان وەکو ئاماژەی پێکرا لە سۆنگەی چاوترساندنی خەڵک و بێدەنگکردنی نارەزایی بەردەوامی گەلی کورددا، کە ئەو ساڵانە تورکیای شەڵەژاندبوو، ئەوان پلانی کوشتنی ناوداران و کەسانی چالاکی کوردیان دانا. ئاشکرایە بۆ ئەوان کەسایەتییەکی ناودار و خۆشەویستی خەڵک، کەسێکی وەکو مووسا عەنتەر، یەکێک لە ئامانجە هەرە کاریگەرەکان بووە.

مووسا عەنتەر جگە لەوەی نووسەر بوو، ڕۆژنامەوان بوو، هەروەها لە بواری کاری سیاسەتدا کەسێک بوو چالاک. هەڵکشانی تەمەن سستی نەکردبوو، ئەو پیاوێکی نیشتمانپەروەری بەناوبانگ بوو، لەناو جڤاتی کوردەواری باکووری کوردستان و تورکیادا. نموونەی باڵای کار و خۆڕاگرتنی بەردەوام بوو، نموونەی باڵا بۆ زۆر کەس.

مووسا عەنتەر هێشتا زۆر لە سەرەتای تەمەندا بوو کاتێک لەگەڵ هاوڕێیانی خۆیدا «کامەران بەدرخان، عوسمان سەبری و کەسانی دیکەدا» کۆمەڵەی ڕزگاری کوردستانیان دامەزراند. پاشتریش لە کاتێکدا کە خوێندکاری زانستگەی ئیستەنبوڵ بوو بە شێوەیەکی ئاشکرا و بێ پچڕانەوە لە پای ئازادی و وەکهەڤیدا سەرقاڵی چالاکی سیاسی و کوردایەتی بوو.

ئەو نووسەرێک بوو پێکەنینی بەرهەم دەهێنا. لەناو خەمی بەردەوامدا دەستبەرداری پێکەنین نەدەبوو. پێکەنین بۆ خۆی و بەخشینی پێکەنین و نووسین بە شێوازی کۆمیدی بەردەوام مەراقی ئەو پیاوە بووە. نەک هەر لە نووسیندا، تەنانەت لە زۆربەی دانیشتنەکانی دادگادا، مووسا عەنتەر بە شێوەیەک خۆی پاراستووە، بە زمانێک بەرگری لە خۆی کردووە کە زۆربەی ئامادەبووانی خستووەتە پێکەنین. هاوزیندانییەکانی دەڵێن، ئەو لە زیندانیشدا هەمیشە وەها بووە. هەمیشە بزەی خستووەتە سەرلێوان و بەردەوام بە شێوەیەکی کۆمیدی باڵا لێدوانی سەبارەت بە ڕەوشی سیاسی و کردەوەکانی دەوڵەت پێشکەشمان کردووە. هاوڕێکانی باس لە شێوازی قسەکردنی دەکەن، دەڵێن: ئەو پیاوە کەم قسەی کردووە، بەڵام کاتێک هاتووەتە گۆ، قسەی کردووە و شتی بێ ناوەڕۆکی پێشکەش نەکردووە.

ژمارەی ئەو ڕۆژ و مانگ و ساڵانەی مووسا عەنتەر لە گرتووخانە بەسەری بردوون زۆرن، بەگوێرەی خەمڵاندن بێت یازدە ساڵ و نیون، بەڵام مەگەر کەسێکی شارەزا، یان هاوڕێیەکی خۆی ئەو ڕۆژانەی زیندانی



وی بە تەواوەتی تۆمار کردبێت و بڵاویان بکاتەوە.
هۆکارەکانی گرتن و مانەوەی لە زیندان زۆر و جیاوازن، بەڵام تێکڕا لە سۆنگەی کوردایەتی و نیشتمانپەروەریدا بووە. بەرگرکردن بووە لە زمانی کوردی و مافی بەکارهێنانی ئەو زمانە. بەردەوام شەڕی قەدەغەکردنی ئەو زمانەی کردووە. لەناو هەموو ئەو هۆکارانەدا کە بوون بە مایەی گرتنی مووسا عەنتەر، یەکێکیان زۆر مایەی پێکەنینە، کاتێک لە سەردەمی ڕاپەڕینی دێرسیمدا لە سۆنگەی جنێودان بە دایکی «مستەفا کەمال-ئەتاتورک» 45 ڕۆژی لە زینداندا بەسەر بردووە. دیارە وەکو ئاشنا و ڕۆشناکانی عەنتەر دەیگێڕنەوە، ئەو کەسێک بووە حەزی لە جنێودان کردووە، جنێو بۆ شۆخی و بێ ئەوەی دڵی بەرانبەر بیەشێنێت. ئەوە سروشتی کەسانێکە بە ژمارە کەم نین و لەنێو زۆر گەل و کولتووری جیاوازدا هەن. هەڵبەتە جنێودان لە چوارچێوەیەکی تایبەتی وەهادا بەرانبەر ئامادەی وەرگرتنی بێت. بەڵام دیارە ئەو جنێوەی مووسا عەنتەر بۆ دایکی مستەفا کەمالی ناردووە ناچێتە چوارچێوەی شۆخییەوە و شتێکی سیاسییە.



مووسا عەنتەر لە تەمەنی بیست ساڵیی خۆیدا، لە ساڵی 1938دا بۆ یەکەمجار خرایە زیندان. گرتن و مانەوەی دواجاریشی لە گرتووخانە ساڵی 1990 بوو. دیارە لە دەمی زیندانیکردنی دواییدا تەمەنی لە سەرووی حەفتا ساڵییەوە بوو.

مووسا عەنتەر ساڵی 1918 لە گوندی زڤنگێ سەر بە شارۆچکەی نسێبین «هەرێمی ماردین» لەدایک بووە، بەڵام ماوەیەکی درێژ لە گوندی ستلیلێ ژیاوە و گۆڕەکەیشی هەر لەو گوندە «ستلیلێ» لە باخی ماڵەکەی خۆی دایە. خوێندنی لە کوردستان، لە شاری مێردین و پاشان لە شاری ئەدەنە تەواو کردووە. فێرگەی سەرەتایی لە مێردین، لە فێرگەی خەوتن، کە بە تورکی پێی دەڵێن «یاتلی ئۆکول» تەواو کردووە. ئەم فێرگەیە بەشێکی گرنگ بووە لە بەرنامەی تواندنەوە و بە تورککردنی گەلانی ناتورک لە تورکیادا. فێرگەی خەوتن بەرنامەیەکی گرنگی تواندنەوەی سیستەمی کۆماری تورکیا بووە. ئەو سیستەمە بە تایبەتی بە ئامانجی بە تورککردنی کورد جێبەجێ کراوە. لە چوارچێوەی ئەو بەرنامەیەدا، منداڵانی کورد لە کاتی خوێندندا ناچار دەکران بە درێژایی ماوەی خوێندنەکە لە فێرگە بمێننەوە، واتە تەواوی ساڵی خوێندن لەوێ دەمانەوە بێ ئەوەی بتوانن سەردانی خێزانەکانی خۆیان بکەن. بێگومان لەو فێرگەیە قسەکردن بە زمانی کوردی کاری نەکردە و قەدەغە بوو، بۆیە ئەو فێرخوازانە دەبوو هەموو ژیانیان بە زمانی تورکی بەڕێوە ببەن. دەوڵەت مەبەستی بوو بەو شێوەیە زمانی کوردی لە بیری منداڵان بباتەوە، بەو جۆرە خۆشەویستی و بەردەوام بەکارهێنانی زمانی دایک لە کن منداڵ کاڵ دەکرایەوە. دیارە سەرباری ئەوە مامۆستاکانیش ناچار بوون بەردەوام قسە لە بارەی گرنگیی زمانی تورکی و بە پێچەوانەیشەوە لە دژی زمانی کوردی بۆ قوتابی کورد بکەن.

مووسا عەنتەر ساڵی 1941 لە بەشی فەلسەفەی زانستگەی ئیستەنبوڵ دەست بە خوێندن دەکات، بەڵام پاشان دەستی لێ هەڵدەگرێت و دەچێتە بەشی ماف و ئەو بەشە تەواو دەکات. تەواوکردنی خوێندن لە زانستگە بۆ کوردێک لەو کاتەدا شتێکی کەم نەبووە، بەڵام لەو کارەدا ڕۆڵی دایکی عەنتەر ڕۆڵێکی گرنگ و لە بیرنەکراوە. ئەو ژنە موختارە بووە. پاش ئەوەی باوکی مووسا عەنتەر دەمرێت، ئەو دایکە سەرپەرشتی ماڵبات دەکات و ئەو پشتگیری مووسای



عەنتەر بۆ دەستەبەرکردنی دەنگ و ڕەنگی کورد لە تورکیا.
ساڵی 1959 لەگەڵ 48 کوردی نیشتمانپەروەری دیکەدا دەخرێنە زیندانەوە. پاشان سزای لە سێدارەدانیان بەسەردا دەسەپێندرێت. بەڵام گوشاری دەرەکی دەبێت بەهۆی ئەوەی پاش شەش مانگ زیندانی دەوڵەت ئازادیان بکات. دیارە ئەوان ئەم دۆزە کە بە»دۆزی 49» ناسراوە بەو مەبەستە گرتە بەر تا کێشەی کورد بورووژێنن و بیخەنە بەرچاوی هەموان.
مووسا عەنتەر لە زینداندا یەکەمین کتێب و شانۆنامەی خۆی نووسی، شانۆنامەی «برینا ڕەش» زادەی ڕۆژگارەکانی گرتووخانەیە. ساڵانی 1961-1962 لە ئیستەنبوڵ سەرقاڵی دەرکردنی گۆڤاری دیجلە-فرات بوو. گۆڤارەکە بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی دەردەچوو. بێگومان ئەو دەمە ڕۆژگارێک بوو چاپ و بڵاوکردنەوە بە زمانی کوردی باجی گەورەی دەویست و عەنتەر ئەو باجەی بە زۆر شێوە دا.
ساڵی 1976 پاش ئەوەی لە زیندا ئازاد کرا، گەڕایەوە گوندی ستلیلی و تا ساڵی 1989 لەو گوندە، واتە لە ستلیلی، ژیا. پاشتر دەگەڕێتەوە ئیستانبوڵ. ئیستانبوڵی نەوەدەکان بۆ کورد شارێکی ترە. دەرکەوتنی پارتی کرێکارانی کوردستان و بزووتنەوەکەیان کوردی ئەو شارەی بە جۆرێکی زۆر بەرچاو خستووەتە کار و چالاکی. چەندین ناوەندی ڕۆشنبیری و وەشانخانە و ڕۆژنامە دەکرێنەوە. بۆ یەکەمجار لە مێژووی کوردانی باکووردا، شانۆی کوردی لەو شارە دادەمەزرێت و بەرهەمی شانۆیی بە زمانی کوردی






کوڕی دەکات تا خوێندنی زانستگە تەواو بکات.
"فەسلا خاتوون»ی دایکی عەنتەر یەکەمین ژن بووە لە دیرۆکی تورکیادا کە بووبێت بە موختار. ئەو ژنە هۆکار بووە کە منداڵێک لە ئەشکەوتدا دێتە دنیاوە، بەڵام خوێندنی زانستگە لە ئیستانبوڵ تەواو دەکات.
مووسا عەنتەر لە ساڵی 1944دا لەگەڵ عایشە هالەدا زەماوەند دەکات و دەبن بە هاوژینی یەکتر. کچێک و دوو کوڕیان بە ناوەکانی «عەنتەر، ڕەخشان، دیجلە» دەبێت.
مووسا عەنتەر وەشانکاری زۆر ڕۆژنامە و گۆڤار بوو. هەموو ئەو بڵاوکراوانە لە پای ناساندنی کێشەی کورد و بەرگریکردن لەو دۆزە سازکرابوون. یەکێک لەو بڵاوکراوانە «ئیلەری یورت» بوو، واتە زێدی پێشکەوتوو. ئەو بڵاوکراوەیە ساڵانێکی زۆر خۆی بە کێشەی کورد و پاراستنی ئەو مافەوە سەرقاڵ کردبوو. یەکێک بوو لە هەوڵە بەردەوامەکانی مووسا

پێشکەش دەکرێت، لەو دەمە پڕ لە چالاکی و کارەدا عەنتەر دەگەڕێتەوە ئیستەنبوڵ. ئەو کاتەی ئەو لەوێ دەژیا، واتا سەرەتای نەوەدەکان، بۆ ڕۆژنامەی وەڵات، ئویلکە «بە زمانی تورکی واتە وڵات»، ئۆزگویر گویندەم «ڕۆژەڤی ئازاد»، ئۆزگویر ئویلکە «وەڵات یان زێدی ئازاد» دەینووسی. هەر لە ئیستەنبوڵ لەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕۆشنبیرانی تورک و کورددا، بوو بە ئەندامی دامەزرێنەری ئەنیستیتوتی کوردی و هەروەها ئەندامی دامەزراندنی یەکەمین پارتی سیاسی فەرمی و ئاشکرای کوردی تورکیا، هەپ «پارتی ڕەنجی گەل».

مووسا عەنتەر کە جاری یەکەم ساڵی 1938 گیراوە، دواتر و پاش کودەتاکانی سەربازی 1960، 1971، 1980 چەندین جار بە تۆمەتی کوردایەتی و پروپاگەندەکردن بۆ جوداخوازی دەخرێتە زیندانەوە.

مووسا عەنتەر لە دیدارێکیدا دەڵێت: لە ئەشکەوتێکی نزیک لە گوندی زڤنگێ لەدایک بووم، بەڵام هەر کەسێک مووسا عەنتەری ناسیبێت، شێوازی قسە و پۆشینی جلی بینیبێت، دەزانێت، عەنتەر چ ئەرستۆکراتێکی گەلەکەی خۆی بووە.



یەکێک لە پیاوە ڕۆشنبیر، نووسەر و پۆشتەکان بوو لە شارێکی جەنجاڵی وەکو ئیستانبوڵ. ئیستانبوڵ ئەوە شارەی کە زۆر مرۆڤ لە تێکڕژانی خۆیدا بزر دەکات و بە ئاسانی دەیکات بە ژێرەوە. بەڵام ئەو هەمیشە لەو شارە ناوێکی دیار و دەنگێک بوو بەردەوام دەبیسترا، ئیتر چ بە تورکی، یان بە زمانەکەی خۆی، کە بە درێژایی تەمەنی شەڕی ئازادکردنی ئەو زمانەی دەکرد.

هونەر وزەی پێکەنین لە لای مووسا عەنتەر:

پێشتر ئاماژەم بەوە کرد کە عەنتەر نووسەرێک بوو پێکەنینی بەرهەم دەهێنا. لەناو خەمی بەردەوامدا دەستبەرداری پێکەنین نەدەبوو. بۆ ئەو شۆخی و بەخشینی کەن، شێوازی گرنگی نووسین و خۆدەربڕین بوو. لە تەنگاسی و لە ڕەوشە هەرە دژوارەکاندا پەنای بردووەتە بەر گاڵتە. ڕەنگبێ پەنابردنەبەر نەبووبێت، ئەوەندەی کە کارکردن بەو شێوازە لە کن وی سەردەست بووە. لەم بوارەدا پێویستە ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەم، شێوازی قسەی بێ پەردە و گاڵتەکردن لە لای خەڵکی گوندی ستلیلێ بەنێوبانگە. لە زۆر کەم دەڤەری باکوور شێوازی قسەی بێ پەردە و گاڵتەکردن وەکو ئەو گوندە ڕوون و باڵادەستە لە ئاخافتندا. لەو بوارەدا عەنتەر بەڕاستی خەڵکی ئەو گوندەیە. خۆپاراستنەکانی مووسا عەنتەر لە دانیشتنەکانی دادگادا، یادگاری زۆری لای هاوڕێکانی جێهێشتووە. لەناو هەموو ئەو یادگاریانەی دادگاکردنیدا، یەکێکیان سەرنجڕاکێش و خەندەبەخشە. خەندەبەخش بە جۆرێک کە هەر کاتێک ناوی مووسا عەنتەر و دادگایکردنی کوردان لە تورکیا بێت، مرۆڤ ئەو بەسەرهاتە لە ڕامانیدا دەکەوێتە جووڵە.

وەکو هاوزیندانییەکانی دەیگێڕنەوە، بەتایبەتی نووسەر و ڕۆشنبیر یاشار کایا، کە دروست لەو دانیشتنەی دادگادا هاوڕێی عەنتەر بووە، لە دیدارێکماندا سەبارەت بە عەنتەر، یەشار کایا ئەو بەسەرهاتەی وەها گێڕایەوە:

لە یەکێک لەو جارانەی گرتن و زیندانی کردندا لەسەر بابەتی نووسین بە کوردی و داواکردنی مافی بە کارهێنانی زمانی کوردی، لە لەو دانیشتنەی دادگادا، کاتێک دادوەری «تورک» تاوانی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی و پارچەپارچەکردنی وەڵاتی تورکیا دەخاتە ئەستۆی مووسای «کورد» و هاوڕێکانی،

عەنتەر بێدەنگ و بێ غەم دانیشتووە و گوێ دەگرێت. کاتێک هاوڕێکانی یەک بە یەک خۆپاراستنی خۆیان پێشکەش دەکەن و ئەم نادوێت، دادوەر لەو بێدەنگییەی عەنتەر سەرسام دەبێت. دادوەر ڕوی تێدەکات و دەڵێت:

- مووسا عەنتەر تو بۆ خۆت ناپارێزیت و هیچ ناڵێیت؟
- هیچ ناڵێم، چونکە ئاخافتن نامانگەیەنێتە ئەنجام.
- شتێک هەر بڵێ.
- ناڵێم چونکە لە یەکەوە دوورین.
- شتێک هەر بڵێ.
- باشە، کەوابێ بەسەرهاتێک دەگێڕمەوە.
- فەرموو، دەتوانیت دەست پێبکەیت.

مووسا عەنتەر بە شێوازی ئیرۆنی خۆی دەست بە قسە دەکات. بێگومان هەموو ئامادەبووان لە قسەکانیدا چاوڕێی شتێکی تایبەت دەکەن.

عەنتەر دەست بە قسە دەکات:

لە یەکێک لە کۆلانە سەرنجڕاکێشەکانی پاریس، کچێکی جوان ناو دەرگای گرتووە و ڕاوەستاوە. کچێک بە جوانی خۆیەوە دەنازێت. لاوێکی خوێنگەرمی پروزە بەوێدا تێدەپەڕێت و کچە دەبینێت. لاوەکە لە کن کچە دەوەستێت، تەماشایەکی ئەو هەموو جوانییە دەکات و دەڵێت:

- بۆ ماچێکم لەو لێوانەت نادەیتێ؟
- بە ڕێی خۆتدا دەڕۆیت یان بە پێڵاوەکەم یەک دوو جار بەسەر و گوێلاکتدا بکێشم؟

کوڕە زۆر لەسەرخۆ، بەڵام پڕواتایانە بە کچەکە دەڵێت: شۆخی ئازیز، من زۆر بەرەو سەرێ هەڵکشام و تۆیش زۆر بەرەو خوار داکشایت. بۆچ نایەیت لە ناوەڕاستدا یەک بگرین؟

عەنتەر بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

جەنابی دادوەر، من باس لە مافی سادە و سروشتی بەکارهێنانی زمانی خۆم دەکەم و تۆیش بە تێکدەری وەتەن و پارچەپارچەکردنی وەڵاتی تورکیا تاوانبارم دەکەیت. من و تۆ زۆر لە یەکتر دوورین، پێویستە وەکو ئەو کچ و کوڕە لە ناوەڕاستدا یەک بگرین.

بێگومان مرۆڤ دەتوانێت مەزەندە بکات پاش ئەو قسانەی عەنتەر چۆن شەپۆلی پێکەنین هەموو هۆڵی دادگا دەکات بەژێرەوە. عەنتەر دادگا چۆن نوقمی پێکەنین دەکات، دادگایەک بێهوودە دەیەوێت ئەو وزەی پێکەنینە بەند بکات!. عەنتەر بەردەوام بەو شێوازی قسەکردنەی شکۆی دادگای بریندار کردووە. لەو بەسەرهاتەوە حاڵی دەبین شێوازی قسە و نووسینی «شۆخی ئامێز» لە لای عەنتەر چەند سەردەست بووە. لە دادگادا لە بری ترس و شڵەژان **بەو جۆرە** بزەی بەخشیوە بە لێوان و بەو شێوازە **تایبەتە کاڵتەی** بە دادگا و دادوەر و ئەو **یاسایانە کردووە کە ئەو** تاوانبار دەکەن.

لە دانیشتنێکی تری دادگادا ئەم **بەسەرهاتەمان لە** عەنتەرەوە بۆ ماوەتەوە.





ساڵی 1963 مووسا عەنتەر فەرهەنگێکی کوردی-تورکی ئامادە کردووە. ئامادەکردنی ئەو فەرهەنگە دەبێت بەهۆی گرتن و دادگایی کردنی. دادوەر مەبەستی ئەوەیە «درۆ»ی سیستەم و سیاسەتی فەرمی بکات بە «حەقیقەت» و بە شێوەی یاسایی نادادی بسەپێنێت. دادوەر ڕوو دەکاتە عەنتەری «تاوانبار» و دەڵێت: ئەو زمانەی تۆ باسی دەکەیت، مەبەستی زمانی کوردییە، بێ ئەوەی ناوی ببات، نیوەی فارسییە و نیوەکەی تری زاراوەیەکی تورکییە. هەر ڕووی لە عەنتەرە و دەڵێت:

لەو فەرهەنگەت کە دوازدە هەزار وشەی تێدایە، 3080 وشەی تورکییە، 2000 وشەی عەرەبییە، 1030 وشەی فارسییە، 1240 وشەی زەندییە، 370 وشەی پەهلەوییە، 120 وشەی ئەرمەنییە، 100 وشەی کلدانییە. لە سەرتاپای فەرهەنگەکەت 30

وشەی تێدایە کە دەنگی ئەو زمانە «دووبارە بێ ناوهێنانی زمانی کوردی» بن تۆ باس لە هەبوونی دەکەیت. دادوەر بەو جۆرە سەبارەت بە کارەکەی وی دەدوێت. مووسا عەنتەر لە وەڵامدا دەڵێت: دادوەر بەگ، تەنانەت مریشک بە مریشکی خۆی 30 جۆرە دەنگ و گارە گارە دەردەخات. بە **چ ئاوەزێکەوە ئەوە دەڵێیت و دەخوازیت بڕوا بەوە بکەین قسەکەت راستە و گەلێکی بە ژمارە زۆری وەکو کورد خاوەنی تەنها 30 دەنگن! قاقای پێکەنین لە بەراوردکردنی دەنگەکانی مریشک و دەنگەکانی زمانی کوردیدا بووە** بە پێکەنینێکی مێژوویی و پاشتر زۆر کەس باسیان لێوە کردووە.

دەڵێن، کاتێک دادوەر بڕیاری کۆتایی دەخوێندەوە، مووسا عەنتەر لە بری گوێگرتن، لەبەر خۆیەوە، بەڵام بە جۆرێک بێتە بیستن، دەیگوت: «سەربارى ئەوەیش سازی دەکەین و کاری پێدەکەین.» مەبەستی زمانی کوردی بووە.

بێگومان مووسا عەنتەر بە تەنها ڕەخنەی لە داگیرکەران نەگرتووە. نەخێر لە «بە هیچ نەبوونی» میللەتەکەیدا ڕەخنەی توندی لە خۆیشمان گرتووە. ئەو لەو بوارەدا ڕستەیەکی گرنگی هەیە کە دەڵێت: «دوژمنەکانمان ئەوەندە بەهێز نین، بەڵام کێشە ئەوەیە خۆمان هێشتا بوونمان نییە.»

**ئەنیستیتوتی کوردی... دواهەنگاو:**

لە ١٩٩٢/٤/١٨دا لە لایەن دەستەیەک لە ڕۆشنبیرانی کورد و تورکەوە لە شاری ئیستانبوڵ ئەنیستیتوتی کوردی دامەزرا. لەناو ئەو دەستەیەدا ئەم ناوانە هەبوون: مووسا عەنتەر، ئیسماعیل بێشکچی، یاشار کایا، فەقێ حوسێن ساگنیچ، عەبدولڕەحمان دورە، جەمشید بەندەر، ئیبراهیم گوربوز، شەفیق بەیاز و سلێمان ئینانئۆغلو. ئەو دەستەیە لە هەڵبژاردنی خۆیاندا مووسا عەنتەریان بە سەرۆکی ئەو دەزگایە هەڵبژارد. لە مانگی نۆی ئەو ساڵەدا مووسا عەنتەر بە مەبەستی ئامادەبوون لە فێستیڤاڵی کولتووری لە شاری ئامەد «دیاربەکر»دا، سەردانی ئەو شارە دەکات. ئەو ساڵانە باکووری کوردستان لەنێو ڕەوشێکی ئاڵۆز و نادڵنیادا دەژیا. دەوڵەت باری نائاسایی ڕاگەیاند بوو. کۆمەڵێک دامەزراوی چالاکی دەوڵەت لە بواری تۆقاندن و کوشتندا بە ناوی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر لە کاردا بوون. لە ئامەد لە ڕۆژی ١٩٩٢/٩/٢٠دا لە لایەن بکوژانەوە، بکوژانێک کە ئەو دەزگایانەی دەوڵەت لە پشتیانەوە بوون، مووسا عەنتەر دەخرێتە داوەوە و دەیکوژن. ئەو دەمەی مووسا عەنتەر کوژرا، تەمەنی 74 ساڵ بوو. بێگومان کاتێک لە شاری ئامەد مووسا عەنتەر دێتە ڕەڤاندن و پاشان لاشەکەی دەدۆزرێتەوە، بە ئاشکرا پێوەی دیارە بە فیشەک کوژراوە.

پیاوە ترسنۆکەکان هەمیشە دەتوانن بکوژن. بەردەوام دەشێن جەستە لەناو بەرن. بکوژان مووسا عەنتەری بە جەستە لاواز و پیریان کوشت، بەڵام دەنگدانەوەی پێکەنینەکان کە ئیرۆنی و هونەری کۆمیدیای عەنتەر سەرچاوەیانە لە یادەوەریی خەڵکدا شەپۆل دەدەن. وزەی پێکەنین بەخشی ئەو بەردەوام زیندووە و هەناسە دەدات. بێگومان بکوژان مەبەستیان بوو ئەو دەنگە کپ بکەن و بەژنی ئەو چنارە بشارنەوە، بەڵام نەیانزانی ئەو چنارە، بەژنێکی هەس هەرگیز بزر نابێت و بەردەوام لە هەموانەوە دیارە.

لەو ڕۆژەوەی کە مووسا عەنتەری تێدا کوژرا، تا ساڵی 2008 هیچ کەسێک لە کاربەدەستانی باڵا یان نیمچەباڵای دەوڵەتی تورک نەیانوێرا و نەیانویست باسی کوشتنی ئەو «پێکەنین»ە بکەن. پیاوێک سەرچاوەی پێکەنین و ئیرۆنی بوو، کەچی کوشتیان.

هیچ کەس باسی کوشتنی ئەو پێکەنینەی نەکرد، تاکو لە ڕۆژی ٢٠٠٨/٥/٢٧دا لەکۆبوونەوەی جەماوەری فراوانی خۆیدا لە شاری ئامەد، سەرۆکوەزیرانی وەڵاتەکە، ڕەجەب تەیب ئەردۆگان کاتێک باسی لە کرانەوە بە ڕووی کێشەی کورد و هەنگاونان بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە دەکرد، ئاماژەی ڕوونی بە ناوی مووسا عەنتەر دا و گوتی:

«برین و ژانی ئاپێ مووسا واتە مووسا عەنتەر لە بیر ناکەین.» ئەردۆگان دیار بوو بە مەبەست بە کوردی ناوی «ئاپێ» مووسا دێنێت. بەڵام ئایا ئەردۆگان چی کرد و چی دەکات؟ ئایا ئەو سیاسەتوانە لە سۆنگەی لە بیرنەکردن و تیمارکردنی برینی ڕەش[***]ی مووسا عەنتەردا هیچی کردووە؟

پێویستە ئەردۆگان و سیاسەتوانانی تورک بۆ تیمارکردنی برینە زۆر و کاریگەرەکانی جەستەی تورکیا سەرلەبەری سیستەمی دەسەلات لە وەڵاتەکەدا بگۆڕن. پێویستە لەوێ، لە کەلاوەکانی چەوساندنەوە نکوڵیکردن لە گەلان و زمانانی تری نا تورکی، لەو سەرزەوینە وەڵاتێکی تر ساز بکەن. دەبێت وا بکەن، دەنا هیچ برینێک سارێژ ناکرێت.

ئەو قسانەی ئەردۆگان بۆ چارەسەرکردن و تیمارکردنی برینەکان، دەمانگەڕێننەوە بۆ لای عەنتەر. بۆیە لێرەدا بە پێویستی دەزانم، یەکێک لە بەسەرهات و «نوکتە» نایابەکانی مووسا عەنتەر ببێت بە دوابەشی ئەم نووسینە. نوکتەیەک کە مووسا عەنتەر زۆر جاران لە وەڵامی گۆڕینی سیستەمی سیاسی تورکیادا وەکو نموونەی خەندەبەخش ئاماژەی پێکردووە. هەرچەندە نوکتەکە شێوازی ئێمەیش نەبێت و ڕەخنەمان لە «نا» پەردەپۆشیی هەبێت، بەڵام ئیتر ئەوە عەنتەر و دنیای ئیرۆنی وی بووە و ئەو لە سنووری خۆیدا، چ دادگا بووبێت، چ زیندان یان سەکۆی سیمینار و هتد قسەی دڵی خۆی کردووە و هیچی نەشاردۆتەوە.

کاتێک لە مووسا عەنتەریان پرسیوە ڕات بەرانبەر بە گۆڕان و چاکسازی دەوڵەت چییە، گوتوویەتی دەبێت، لەم دەوڵەتەدا دەوڵەتێکی تر دروست بکرێت، ئەو ڕای وابووە و گوتوویەتی: ئەم دەوڵەت «خێری نەماوە». بۆ پشتگیری قسەکەی خۆیشی ئەم بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە:

ژنێکی بە تەمەن گەنج و بە سیما جوان، منداڵێکی پێیە و دەچێتە لای دکتۆر، هەر لە سەرەتاوە جوانیی ژنەکە سەرنجی دکتۆر وەکێش دەکات. دکتۆر لە ژنەکە دەپرسێت، نەخۆشیی ئەو منداڵە چییە؟

خاتوون دەڵێت:

– لەم تەمەنە دایە و هێشتا قسە ناکات.

– وەکو تر؟

– تا ئێستا ناتوانێت بە ڕێوە بڕوات.

– ئێ؟

– چاوەکانی خوارن و زۆر خراپ دەبینێت.

– بە داخەوە، وەکو تر؟

– میزیش بە خۆیدا دەکات و جار بە جار بە خۆیدا دەڕی.

دکتۆر تەماشایەکی پرتاسەی خاتوون دەکات، ئاماژە بە منداڵەکە دەکات و دەڵێت:

– خانمی من، ئەم منداڵە تیمار ناکرێت. باشترین شت ئەوەیە پێکەوە منداڵێکی تر دروست بکەین.

مووسا عەنتەر پێی وا بوو باشترین شت بۆچاککردنی تورکیا ئەوەیە، تورک و کورد و گەلانی تری ئەو وەڵاتە پێکەوە تورکیایەکی نوێ بنیات بنێن...

**پەراوێز:**

"JITEM* "
(هێزی ژەندرمەی نهێنی) ئەم هێزە لە چوارچێوەی دەزگایەکی فەرمیدا سازکراوە و یەکێکە لە دەزگا ترسناک و بە هێزەکانی (دەوڵەتی قوڵ).



لەو ڕۆژەوەی تورکیا (ساڵی 1951) بوو بە ئەندامی ناتۆ، ئەم دەزگایە بە مەبەستی پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ و بنەماکانی کەمالیزم دامەزرێندراوە.

هەڵمەتی لەناوبردن و کوشتنی بازرگانان، ڕۆشنبیران و ناودارانی کورد بە ناوی «فاعیلی مەجهول جینایەت- تاوانی بکەر نادیار»، ئەو تاوانانە بوون کە ئەم ڕێکخستنە و بکوژەکانی بەڕێوەیان دەبرد. دیارە لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا ئەم ڕێکخستنە «حیزبولا»یان وەکو بەشێک لە ئۆرگانە ترسناکەکەی دەوڵەتی قوڵ دورست کرد تا لە تیرۆرکردن و کوشتنی نیشتمانپەروەرانی کورد و دیموکراتخوازانی تورکیادا سوودی لێ ببینن و پاشتر هەر خۆیان ئەو حیزبەیان لەناو برد.

بە درێژایی چەندین ساڵ کەسانێکی زۆر بوون بە قوربانیی بکوژانی بکەر نادیار و دەوڵەتیش تەماشاڤانی ئەو ڕووداوانە بوو.

** Derin Devlet بە تورکی واتای «دەوڵەتی قوڵ. دەوڵەت لەنێو دەوڵەتدا»، ئەمە لە تورکیا زاراوەیەکی ناسراوە. ئەم «دەوڵەتی قوڵ»ە هێزگەلی سیاسی، دەزگاکانی ئاسایش، دەسەڵاتی دادوەری، بەڕێوەبەرایەتییەکان و ڕێکخراوەکانی کوشتن، بەتایبەتیش «کۆماندۆی کوشتن» دەگرێتەوە، ئەمانە کۆمەڵێک ستوونن کە ئەو دەوڵەتە شاردراوەیەی نێو دەوڵەت لەسەریان بەندە. ڕووبەری قسەکردن سەبارەت بە «دەوڵەتی قوڵ» لەگەڵ سکاندالی سوسورلوک «1997»دا فراوانتر بوو. «دەوڵەتی قوڵ» لە حەفتاکانیشدا «سەدەی بیست» لە ڕێگەی دەزگاگەلی نهێنی وەکو «کۆنترگەریلا» «بەڕێوەبەرایەتیی شەڕی تایبەت» کارەکانی خۆی بەڕێوە دەبرد.

*** شانۆنامەیەکی مووسا عەنتەرە.

**سەرچاوە:**


- بیروەرییەکانم، مووسا عەنتەر، بەشی یەکەم و دووەم.
- یەشار کایا،
Koca Çınar Musa Anter
Kürt Demokrası Vakfı
1993
- یەشار کایا، دیداری تایبەت سەبارەت بە مووسا عەنتەر.
- یەشار کایا دیداری تایبەت
23Kürt Azdınları
Meypotamya Yayınları 1998
- ڕەجەب مەراشلی،
..Apê Musa: Son fıkra
www.gelawej.net
- بەشێک لە وتارەکانی مووسا عەنتەر لە ڕۆژنامەی وەلات. وەلات هەفتەنامەیەک بوو لە سەرەتای نەوەدەکاندا لە ئیستەنبول بە کوردی دەردەچوو، تا ساڵی 1994 بەردەوام بوو، کۆتایی ئەو ساڵە لە لایەن دادگای ئاسایشی دەوڵەتەوە داخرا. ماوەیەکی زۆر مووسا عەنتەر لەو ڕۆژنامەیە گۆشەی تایبەتی خۆی هەبوو، ناوی گۆشەکەی «تیر» بوو.






# دوایین دیداری باوک

وەرگێڕانی لە تورکییەوە:

سەلاحەدین بایەزیدی

**ئاماژە:** پار لە کاتێکدا بیست ساڵی تەواو بەسەر تیرۆری مووسا عەنتەری نووسەر و رۆژنامەنووسدا تێپەڕیبوو، کتێبی «رەشێ – مووسا عەنتەر لە چاوی کچەکەیەوە» بە قەڵەمی خەدیجە کامەر و لە لایەن وەشانخانەی «ئیلەتیشیم»ەوە کەوتە بەر دیدی خوێنەرانییەوە. خەدیجە کامەر وتوویژێکی دوورودرێژی لەگەڵ رەخشان عەنتەر یۆرۆزلوو پێک هێناوە و هەوڵی داوە تیشک بخاتە سەر لایەنێکی دیکە لە ژیانی مووسا عەنتەر و بەتایبەتیش ساتەوەختی تیرۆرەکەی و ساڵانی دواتریش. کتێبەکە کە هاوکات هەوڵی داوە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەگەلی تریش، لە ٢٥٠ لاپەڕە پێک هاتووە و بە کۆمەڵێک وێنەی تایبەت دەوڵەمەند کراوە. ئەمەی لە خوارەوە دێت تەنیا وەرگێڕانی بەشێکە لە کتێبەکە کە هەر بەو ناوە لاپەڕەکانی ١٨٤ هەتا ١٩١ی کتێبەکەی گرتووەتە خۆ.

***

رەخشان دوایین جار، مانگی حوزەیرانی ١٩٩٢ چاوی بە باوکی کەوتووە. لەم دوایین چاوپێکەوتنەدا، لە ماڵەکەیان لە گەڕەکی دراگۆس، مووسا عەنتەر زۆر خەمبار بووە.

خواردبوویەوە و گریابوو، گوتی: «وەرە کچم.» نازانم چۆن وەسفی گریانەکەی بکەم. پێی گوتبووم: «کچم، من بە مرۆڤ دانانێن. کە دەچمە ناوەندی رۆژنامەکە [مەبەست رۆژنامەی گویندەم-ە، و]، بە تەواوی مانا چاپچێتی دەکەم، تەنانەت ژوورێکیان پێ نەداوم، کەس نییە بە رێکوپێکی سڵاوم لێ بکا.» هەروەک پێشتر گوتم، باوکم مرۆڤێکی زۆر خاکەڕا بوو؛ لە لای منداڵێک دەبوو بە منداڵ، لووتبەرز و شتی وا نەبوو. بۆیەش، هەتا لە ژیاندا بوو، قەدریان نەزانی و رێزی نەگیرا. پێم گوت: «مادام بەرەڕووی هەڵسوکەوتی وا خەفەتبار دەبیتەوە، تکایە مەچۆ. باوەش بە هەموو کەسێکدا دەکەی کە بڵێی کوردم، بەڵام هەموو مرۆڤێک قەدرزان نییە.» کە بینی زۆر خەفەتی پێوە دەخۆم، ئەم جارەیان بۆ ئەوەی دڵم بداتەوە، بە گاڵتە گوتی: «گوێ مەدەرێ خاتوو تاتاری.»

باوکم لە رۆژنامەکەدا گۆشەیەکی هەبوو، بەردەوام وتاری دەنووسی، بەڵام هەندێک جار کە زمانێکی توند و جنێوئاسای بەکار دەهێنا، بۆی هەبوو وتارەکانی بڵاو نەکەنەوە. وەک چۆن لە ناوەندی رۆژنامەکە ژوورێکیان پێ نەدابوو، بۆ ناردنی ئەو وتارانەی لە ماڵەوە دەینووسین، تەنانەت ئامێرێکی فاکسیشیان بۆ دابین نەکردبوو. ئەو وتارانەی لە خانووەکەی گەڕەکی دراگۆس دەینووسین، هەتا شەقامی ئەمینئۆنو دەیبردن و رادەستی رۆژنامەکەی دەکردن. ئەو جارەیان لێی تووڕە بووم و گوتم: «بۆچی ئامێرێکی فاکسی بەتەلەفۆنت لە ئێمە داوا نەکرد؟» باوکم ئەمانەی بە گریانەوە گێڕایەوە. ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانەم بە هیچ شێوەیەک بۆ هەرس نەدەکرا. هەم ئەو شتانەی باسی کردن و هەم گێڕانەوەیان بەدەم گریانەوە، منیان زۆر ئازار دا. یەکسەر پرم دایە تەلەفۆنەکە و گوتم: «تۆ دەبێ قسە بکەی باوکە، دەبێ بۆیان باس بکەی کە چەندە بەم جۆرە هەڵسوکەوتانە بێزار دەبی.» گوتی: «باشە.» کاک یاشار (کایا) ئەودەم بەڕێوەبەری رۆژنامەکە بوو. باوکم گوتی: «هەموو شتێک باس دەکەم.» زەنگمان لێ دا، بەڕێوەبەرەکە هەرچەند خۆی لەوێ بوو، ئامادە نەبوو لەگەڵ باوکم بدوێ. کاتێک ئەو نەهاتە پشت هێڵ، باوکم لە تەک هالوک گەرگەردا ئاخفی. چی بە من گوتبوو، موو بە موو بۆ ئەویشی گێڕایەوە، بێزاربوونی خۆی دەربڕی، گوتی چیتر

نانووسێ. هالوک گەرگەر ژیرانە هەڵسوکەوتی کرد، باوکم ئەهوەن بووەوە و گوتی داواکارییەکانی جێبەجێ دەکەن.

دوای ئەم گفتوگۆیە ئامێرێکی فاکسیان بۆ باوکم ناردبوو بەڵام بەداخەوە دەرفەتێکی ئەوتۆی بۆ نەڕەخسا سوودی لێ وەربگرێ. مانگی ئەیلوول تەقەی لێکرا.

ڕەخشان، ڕۆژێک پێش گەڕانەوەی بۆ سوید، بۆ دوایین جار لە خانووەکەی گەڕەکی دراگۆس سەری لە باوکی دا. دوای گفتوگۆ تەلەفۆنییەکە، ئاسوودە بیوو. لە دواچاوپێکەوتنیاندا، مووسا دیسان بەوپەڕی سۆزەوە پێشوازی لە ڕەخشان کردبوو.

ڕەخشان دەگێڕێتەوە: «دۆخی ڕۆحی باوکم زۆر جیاواز بوو، بە جۆرێک بێقەرار بوو کە نەمدەتوانی مانای پێ بدەم.» مەنجەڵی مسین کە لە گوند هێنابوونی، نیسکێک کە بەرهەمی کێڵگەکەی خۆی بوو، ساوەر، پەنیر، یاسەمەنی عەرەبی کە زۆری خۆش دەویستن و مەلەکەی ناو قەفەزی دا بە ڕەخشان بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بیانبا.

هەوڵم دا دەست بە ڕوویەوە بنێم و گوتم «باوکە، ئەمانە چۆن هەتا سوید بەرم؟»، بەڵام بێسوود بوو، ئەو گوتی: «دەتوانی بیانبەی.» هێند بێقەرار بوو دەتگوت پێشتر قەت هیچی پێ نەداوم. کاتێک بیر لەم دوایین چاوپێکەوتنە دەکەمەوە، تێدەگەم کە هەستی بەوە کردبوو ئێمە جارێکی دیکە چاومان بە یەک ناکەوێتەوە، دەتگوت باوکم هەستی بەوە کردبوو کە دەمرێ.

***

ڕەخشان لە ئاکامی خەباتێکی حەوت ساڵەدا و دوای ئەوەی پشکی دەبێ لە چاککردنەوە و ڕاهێنانەوەی گەلەک منداڵ، لە ناوەندی کارەکەی دەبێتە یەکێک لەو فەرمانبەرانەی کە ڕێزی لێ دەگیردرێ. کاتێکیش کێشەی زمانی بە تەواوەتی یەکلایی کردەوە و گەیشتە ئاستێک کە دەست بە خوێندنی زانکۆ بکا، بڕیار دەدا لە بواری ڕاهێنانەوەدا زیاتر خۆی پێش بخات و لە خوێندنگەیەکی باڵای تایبەت بەم بوارە ناوی خۆی تۆمار دەکات. لەبەر ئەزموونی کردەیی لە کارەکەدا، دەبێ سێ ساڵ خوێندن بە دوو ساڵ تەواو بکا. بە هۆی تەواوبوونی نمرەی هەموو دەرسەکانی و درێژەدان بە خوێندن، زۆر دڵخۆشە.

دوای گەڕانەوەی لە تورکیا، دکتۆرەکانی دایکی ڕایانگەیاند کە بەهۆی گیرانی دەمارەکانی دڵ، دەبێ نەشتەرگەرییەکی کراوەی دڵی بۆ بکرێت. پاش نەشتەرگەرییەکی قورس، هالەی دایکی خوڵق و خووی گۆڕا. ڕەخشان ماوەیەک لە لای دەمێنێتەوە و هاوکاری دەکا، پەیتا پەیتاش بە تەلەفۆن لەگەڵ باوکیدا دەدوێ.

لەو هەفتەیەدا هەلی ئەوەی بۆ نارەخسێ دەربارەی ناونووسینی لە خوێندنگە، کاروبار و هەوڵەکانی یەکسەر لەگەڵ باوکی بدوێ، بەڵام لە دایکییەوە هەواڵی ئەوەی پێ دەگا کە باوکی بانگهێشتی فێستیڤاڵێکی دیاربەکر کراوە.

بێگومان دەترساین. چوونی باوکمان بە تەنیا بۆ دیاربەکر، ئەویش لە کاتێکدا کە ئەودەم گەلەک کەس دەبوونە قوربانی کردەوەی بکەری نادیار، ترس و خۆفی خستبووە دڵمانەوە، نەماندەویست بچێ، بەڵام ئەو گوێی پێ نەداین. بە تەلەفۆن لەم بارەوە لەتەک باوکمدا قسەم کرد. ئاماژەی بەوە کرد شتێک لە گۆڕێ نییە بۆ ئەوەی لێی بترسین و گوتیشی: «چ کاریان بە پیاوێکی پیری وەک من داوە؟ با دڵت ئاسوودە بێ.»

مووسا، هەموو جارێ کە دەڕۆیشتە دیاربەکر لە هۆتێلی «دەمیر» دەمایەوە، بەڵام ڕێکخەرانی فێستیڤاڵەکە لە «بیوک هۆتێل» شوێنیان بۆ میوانەکان تەرخان کردبوو. هالە لە کاتی مانەوەی مووسادا، تەلەفۆن بۆ هۆتێلەکە دەکا و دەربارەی دۆخی ئەوێ زانیارییان لێ وەردەگرێ.

ڕەخشان، ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٩٢، لەگەڵ



دایکی دەچێتە پێشانگەیەکی پەیکەر لە شاری ڤێسترۆس. کاتێک دەگەڕێنەوە ماڵێ، دایکی تەلەفۆن بۆ هۆتێلەکە دەکا و لە دۆخی مووسا دەپرسێ، بەڵام فەرمانبەرانی هۆتێلەکە دەڵێن بە مەبەستی بینینی هاوڕێیەکی ڕۆیشتووەتە دەرێ.
ڕەخشان دوای پێدانی دەرمانەکان و خواردن بە دایکی، دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی.
لە دیاربەکر، مووسا کتێبەکانی واژۆ دەکات و هیچ گرفتێک نایەتە گۆڕێ. ڕۆژی یەکشەممە، بە مەبەستی پشوودان دەچێتە ژوورەکەی، لەسەر تەلەفۆنێکی بەشی پێشوازی هۆتێلەکەڕا، دەچێتە نهۆمی خوارەوە. میوانەکەی ئۆرهانی برای پارێزەر شێخموس میرئۆغلۆیە کە دوای گیرانی مووسا بەهۆی پێشکەشکردنی وتارێکی لە پانێلێک کە نیسانی ساڵی ١٩٩٠ لە دیاربەکر ڕێک خرابوو، پارێزەرێتی بۆ کردبوو. لە دوایین سەفەری مووسا بۆ دیاربەکر، باوکی میرئۆغلۆکانیش بۆ هەموو چالاکییەکان لەگەڵیدا چووبوو. ئۆرهان بە دوای مووسادا هاتبوو، چونکە لە دوایین ڕۆژی فێستیڤاڵەکەدا بانگهێشتی ماڵەوەیان کردبوو. میرئۆغلۆ لە کتێبەکەیدا بە ناوی تاوانەکەی مووسا عەنتەر شایەتیدانە مێژووییەکەی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە.[1]
لەو ڕۆژەوەی کاک مووسا هاتبووە دیاربەکر، باوکم قەت بە تەنیا بەجێی نەهێشت. لە ڕۆژی واژۆکردنی کتێبەکاندا کۆڵێک وێنەیان پێکەوە گرتووە. چەندان سەعات پێکەوە بوون. من داخم دەخوارد کە لەوێ نەبووم، بەڵام پاشان لەگەڵ باوکمدا بڕیارمان دا ڕۆژی یەکشەممە کاک مووسا بانگهێشتی ماڵەوە بکەین، دووشەممەش بڕیار بوو بیگەیەنمە فڕۆکەخانە.
تەلەفۆنم بۆ کرد، بە شێوازی دەنگی لەوە دەچوو هەندێک بەپەرۆش بێ. گوتی لە زۆر شوێن بانگهێشت کراوە، بەڵام هیچیانی پەسند نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری دابوو دڵم نەشکێنێ و بێ. بۆ شەوی یەکشەممە پێک هاتین، بڕیار درا من لە هۆتێلەکە بە دوایدا بچم.
ڕۆژی یەکشەممە، کاتێک لە ماڵەوە دەرکەوتم بۆ ئەوەی بە دوایدا بچم، سەعات ببووە پێنج. بە تاقی تەنیا بە پێیان بەرەو هۆتێلەکە ڕۆیشتم.
کاتێک حەمید یڵدرم (دژوار) هاتە هۆتێلەکە، من و مووسا عەنتەر لە نیمچە نهۆمەکە دانیشتبووین. ئەو هەواڵەکانی دەخوێندەوە، یەکێک لە فەرمانبەرەکانی هۆتێلەکە گوتی: «کاکە ئەو میوانەی چاوەڕێی بوون، هات.» حەمید یڵدرم هاتە لامان، ماوەیەک لەسەر پێ ڕاوەستا. کاک مووسا لە جێی خۆی ڕاست بۆوە و پێکەوە بە ئاسانسۆرەکە چوونە سەرێ، ڕۆیشتنە ئەو ژوورەی مووسا عەنتەر لێی دەمایەوە. نازانم لەوێ چ ڕووی دا، زۆری پێ نەچوو دیسان پێکەوە هاتنە خوارێ. کاک مووسا جلەکانی گۆڕیبوو، پانتۆڵێکی سپی و تیشێرتێکی ڕەشی قۆڵدرێژی پۆشیبوو.
هەرسێکمان لەگەڵ کابرایەک کە نەمدەناسی و کتێبی هێنابوو بۆ ئەوەی نیشانی کاک مووسای بدا و هەروەها سوبحان مەتەی خوارزای مووسا عەنتەر ڕۆیشتینە دەرێ.
سوبحان و ئەو کەسەی کتێبی هێنابوو، لە ئێمە دوور کەوتنەوە، مووسا عەنتەر لێی پرسیم: «ئۆتۆمبێلت هەیە؟» گوتم: «نەخێر.» گوتی دەچینە سەیرانتەپە. گوتم: «بە تاکسی دەچین.» تاکسییەک لە بەرانبەرمان ڕایگرتبوو، لەبەر نەبوونی موشتەری، شۆفێرەکەی لە هۆتێلەکە خەوتبوو، خەبەریان کردەوە، هات و کەوتینە ڕێ. کاتێک بە «ئۆردوئەڤی»دا تێپەڕین، هەوا تاریک ببوو. حەمید هاتبوو تاکو مووسا عەنتەر ڕادەستی

[1] Orhan Miro⊠lu, Ku⊠atmadan Infaza Musa Anter Cinayeti, Everest Yayinlari, 2012.

ئەو گرووپە بکات کە هۆگر و پەشیل-یشی تێدا بوو. بەلام من لە بەرنامەدا نەبووم، لەبەر ئەمەش حەمید بەپەرۆش و لە هەوڵ و تەقەلادا بوو. لە کاتێکدا پەشیل و دەستەکەی لەسەر ڕێگەی سیلڤان چاوەڕێی بوون، ئەو بەپەلەپەل ئێمەی خستە سەر ڕێگەی ئەرخەنی. ئەوانەی چاوەڕێی بوون، بۆیان دەرکەوتبوو کە شتێکی نائاسایی ڕووی داوە، چونکە حەمید زۆری پێ چووبوو. هەڵەداوانی حەمید، ژیانی من و شۆفیرەکەی ڕزگار کرد. ئەگەر حەمید ئێمەی ڕادەستی ئەو گرووپە کردبا، نە من و نە شۆفێرەکە ئەو شەوە نەماندەتوانی بە سەلامەتی بۆی دەربچین.

حەمید نەیتوانی چاوی بە گرووپەکەی دەزگای هەواڵگریی ژیتەم بکەوێ. لە ڕوانگەی حەمیدەوە ئەمە ئەرکێکی زۆر گرنگ بوو و خەریک بوو شکستی دەهێنا. بۆیە بڕیاری دا خۆی بە تەنیا مووسا عەنتەر بکوژێ. دوابەدوای ئەم بڕیارە، ئەگەری چاوپێکەوتن لەگەڵ ژیتەمی بەلاوە نا و لە شوێنێک گەڕا بۆ ئەوەی ئێمە لەناو ببات.

لە گەڕەکی جومهوورییەت ڕووی کردە کۆلانی ٣٦ەم، گوایە ئەو ماڵەی دۆزیبووەوە کە کۆبوونەوەکەی تێدا دەکرێ. کاتێک مووسا عەنتەر گوتی: «واز لەو کەرە بێنە»، حەمید لە دواساتدا ئاوڕی دایەوە و هاواری کرد: «ماڵەکەم دۆزییەوە».

بە دوای ئەودا کەوتینە کۆلانەکەوە، چەند چرکەیەک پێش ئەوەی تەقەمان لێ بکرێ، کاک مووسا گوتی بەشداری کۆبوونەوەی «ددانپێدانەرە دڵسۆزەکان» دەبین. ئیتر درەنگ ببوو. کار لە کار ترازابوو. حەمید دەمانچەکەی دەرهێنا و دەستی بە تەقە کرد. من ڕزگارم بوو و ئەو فیشەکانەی ئەو شەوە بەر جەستەم کەوتبوون، بەس نەبوون بۆ ئەوەی کۆتایی بە ژیانم بێنن. بە مەرگی مووسا عەنتەر زۆر پەشۆکام، ئیتر بە درێژایی ژیانم ئەم بیرەوەرییە وازی لێ نەدەهێنام. شتێکیش هەبوو دڵی خۆمم پێ دەدایەوە، هەر نەبێ، مووسا عەنتەر بێ ئەوەی بکەوێتە چنگ ئەو زاڵمانەوە، مرد. ئەگەر کەوتبایە دەست ئەوان، ئەشکەنجەیان دەدا، بێگومان بە ئەشکەنجە دەیانکوشت، هەم ئەو و هەم منیش.

بەگوێرەی گێڕانەوەی عەبدولقادر ئایگان، حەمید لە کاتێکدا دڵنیا بووە کە ئێمەی کوشتووە، دەچێتە بنکەی ژیتەم لە سارایکاپی و چاوی بەو دەستەیە دەکەوێ کە نەیتوانیبوو بیانبینێ. هۆگر بە تووڕەییەوە پێی دەڵێ: «ئێمە بە تۆمان نەگوت مووسا عەنتەر بکوژە، ئەرکی تۆ ئەوە بوو بیهێنی بۆ لای ئێمە.» حەمیدیش ناچار دەبێ خۆی بپارێزێت و دەڵێ: «لە ڕێگەدا کەوتنە گومانەوە، دەیانویست بگەڕێنەوە، بۆیە تەقەم لێکرد.»2

ڕۆژی یەکشەممە، ڕەخشان تەلەفۆنێکی بۆ دێت و دەستبەجێ دەچێتە شوێنی کارەکەی، چەند سەعات دواتر دەگەڕێتەوە ماڵ و هێشتا هەلی ئەوەی بۆ نەڕەخساوە پشوویەک بدا کە بە تەقەی ورتکەبەردێک لەسەر شووشەی پەنجەرەی ژووری دانیشتنەکەی لە جێی خۆی ڕادەچەنێ. کاتێک لە پەنجەرەکەوە لە دەرێ دەڕوانێ، دەبینێ ئەوەی بەردەکەی هاویشتووە دیجلەی برایەتی. دیجلە لە شارێک دەژی کە ٤٥ کیلۆمەتر لە ڕەخشان دوورە و هاتنی کتوپڕی لەم کۆتایی هەفتەیەدا ناکرێ خێری پێوە بێ. لە ترسی ئەوەی نەکا شتێک بەسەر دایکی هاتبێ، بەپەلە خۆی دەگەیەنێتە خوارێ و کاتێک دەرگاکە دەکاتەوە، دەبینێ براکەی زۆر پەشۆکاوە. «دادە، تەقەیان لە باوکم کردووە، باوکمان لەدەست دا.» ڕەخشان بە بیستنی ئەم قسەیەی دیجلە لە جێی خۆی بەلادا دێ. ڕەخشان بەهۆی ئەوەی تەلەفۆنەکەی داخستبوو، هەواڵی




---

2 ڕەخشان عەنتەر یۆرۆزلو گەلەک ساڵ دواتر لەگەڵ ئەرسین کالکانی ڕۆژنامەنووس چاوی بە عەبدولقادر ئایگان دەکەوێ. وتووێژەکەی کالکان لەگەڵ ئایگان دەبێتە کتێب، بەلام لە تورکیا قەدەغە دەکرێ: دۆسیەیەکی ژیتەم: تاوانەکەی مووسا عەنتەر — چاوپێکەوتن لەگەڵ بکوژ، وەشانخانەی گوینجەل، ٢٠٠٦. ئایگان لەم کتێبەدا باس لەوە دەکا کە پلانی کوشتنی مووسا عەنتەر لە لایەن ژیتەمەوە داڕێژراوە.

پێکرانی باوکی لە هیچکام لەو کەسانەوە پێ نەگەیشتبوو کە یەک لە دوای یەک تەلەفۆنیان بۆ کردبوو.

پێش هەموویان «شەنۆل» هەواڵی کوژرانی مووسا عەنتەری بە گوێ دەگا. کاتێک لە ڕۆژنامەی جمهوورییەتەوە پەیوەندیی پێوە دەگرن و هەواڵەکەی پێ ڕادەگەیەنن، تەلەفۆن بۆ ڕەخشان دەکا، بەڵام پەیوەندییەکەی بێئاکام دەمێنێتەوە و ئەم جارە زەنگ بۆ دیجلە لێ دەدا. لەبەر ئەوەی هالە تازە نەشتەرگەریی دڵی بۆ کراوە، دیجلە و ڕەخشان پێیان باشترە سەرەتا حەبی ئەهوەنکەرەوە بە دایکیان بدەن و پاشان ڕووداوەکەی بۆ بگێڕنەوە.

چووینە ماڵی دایکمان. لە کاتێکدا ئێمە شەنوکەوی ئەوەمان دەکرد چۆن هەواڵەکە بە دایکمان بڵێین، چما بەرپرسێکی کۆمەڵەیەکی کوردی لە سوید تەلەفۆنی بۆ دایکم نەکردبوو. پێیان گوتبوو: «مووسا عەنتەر شەهید بووە، خۆتان سەلامەت بن.»

کە چووینە ماڵی دایکمان، ڕەنگی لەڕوودا نەمابوو. گوتی: «بیستوومە.» بۆ ڕۆژی دووشەممە بلیتی فڕۆکەمان بۆ ئیستانبوڵ دۆزییەوە. یەکسەر ڕۆیشتینە ماڵی مەدەد، یوردانوور و سەرحەد. لە کاتێکدا بەرنامەمان دارشتبوو هەر ئەو شەوە بچینە دیاربەکر، کاک مەدەد جەختی کردەوە کە دایکمان لە دۆخێکی باشدا نییە و دەبێ بە شەو پشوو بدەین و بۆ ڕۆژی سێشەممە بلیتی بۆ جێبەجێ کردین.

دیارە من ئێستا بە ئاسانی دەیگێڕمەوە، بەڵام ئەوان ساڵان بەدەستهێنانی بلیت بۆ دیاربەکر بە هیچ شێوەیەک سانا نەبوو، دەبوایە پشتت پتەو بێ. یەکێک لە دکتۆرەکانی تورگوت ئۆزال بە ناوی عیسمەت توغمان هاوڕێی باوکم بوو و بۆ بەدەستهێنانی بلیت تکامان لەو کرد کە بە هانامانەوە بێ. مامە عیسمەت ماڵی ئاوەدان بێ لە فڕۆکەدا شوێنی بۆ گرتینەوە و بەم جۆرە توانیمان بچین.

هەتا ئەندامانی بنەماڵە دەگەڕێنەوە دیاربەکر، مووسا عەنتەر دەمێکە لە گوندی زێدی خۆی بەخاک سپێردراوە. ڕەخشان بێخەبەر لە نێژرانی باوکی، ڕۆژی سێشەممە دوای ئەوەی لە فڕۆکەخانەی دیاربەکر دابەزی، لە لایەن هاوڕێ و دۆست و ناسیاوەکانییەوە پێشوازی لێکرا. ڕاستەوڕاست دەچنە نەخۆشخانەی حکوومی دیاربەکر. خزموخوێش دەڵێن مووسا عەنتەر دوای پێکرانی بۆ ئەم نەخۆشخانەیە گوازراوەتەوە، بەڵام بنەماڵەکەی هیچ زانیارییەکی تۆمارکراو لەسەر تەرمەکە بەدەست ناهێنن.

جاران لەبەر نەبوونی کۆمپیۆتەر، هەموو ئەو حاڵەتانەی بە شەو ڕوویان دەدا، لە دەفتەرێکی گەورەدا تۆمار دەکران. بەڵام لە نەخۆشخانەکە گوتیان ئەو شەوە هیچ شتێک لەسەر باوکم لە دەفتەرەکەدا تۆمار نەکراوە. دەستەودامێنی گشت دکتۆرەکان بووین، بەش بە بەش گەڕاین، بەڵام لەخۆڕا، کەس بە ئێمەی نەگوت کە ئەو شەوە مووسا عەنتەریان هێناوەتە نەخۆشخانەکە.

لە زاری چایچییەک کە بەهەڵکەوت تووشی دەبن، بۆیان دەردەکەوێ کە مووسا عەنتەر پاش پێکرانی، تەرمەکەی بۆ ئەو نەخۆشخانەیە گوازراوەتەوە.

چایچییەکی تەمەن دەوروبەری ٣٥ ساڵ بوو. گوتی: «ئاپێ مووسا لێرە بوو، لێرەوە بردیانە گوندەکەی، لێرەوە بردیانە گۆڕستان.» دواجار چاومان بە دکتۆرێک کەوت، گوتمان دەزانین باوکمان کوژراوە، بە تۆبزی ڕاپۆرتێکی مەرگمان لەو دکتۆرە وەرگرت کە تێیدا ئاماژە بەوە کرابوو باوکمان ئەو ڕۆژە براوەتە نەخۆشخانەکە. بەڵام لە تۆماری دەفتەرە فەرمییەکەدا نەنووسرابوو کە تەرمی باوکمان برداوە.

ـەخشان ناتوانێ هیچ مانایەک بەوە بدات کە سەرەڕای
ـوونی تەرمێک لەو ناوە، لە دەفتەری تۆمارەکاندا بە
ـەرمی هیچ ڕێوشوێنێکی بۆ نەگیرابێتە بەر.
ـشان گوتیان شتەکە ڕوون و ئاشکرایە، ئەگەر بزانرێ
ـوسا عەنتەر کوژراوە، ڕووداوی گەورە دەقەومن،
ـیامەت ڕوو دەدا، گەلی کورد ڕادەپەڕێ. لە ترسی
ـەمەش، بەتایبەت ئەو شەوە لە دەفتەرەکەدا تۆمار
ـەکرابوو.
ـەلە دەچێتە سەردانی ئۆرهان میرئۆغلۆ کە لەو
پەلامارەدا بریندار ببوو و لە هەمان نەخۆشخانە چارە
ـدەکرا.
وەک تروووسکەی هیوایەک لێمان پرسی تەقەکەرەکان
ـدەناسێتەوە، گەلەک گوللەی بەرکەوتبوو و هۆشی بە
خۆوە نەبوو. باوکی لە لای بوو، ئاماژەی بەوە کرد کە
هیچ شتێکی بە بیر نایەتەوە و گوتیشی: «لە پشتەوە
پێکایانین.» لە دۆخێکدا نەبوو وردەکاریی زیاتر بدا،
زۆر خراپ بوو؛ دکتۆرەکان گوتبوویان بۆی هەیە
بمرێ.



**سەرچاوە:**

Kamer, Hatice, Reşê Kızının Gözünden Musa
.Anter, İletişim yayınları, 2022

# ڕەنگدانەوەی بیرەوەرییەکانی مووسا عەنتەر لە ڕۆمانی "بەفر"ی "ئۆرهان پاموك"دا

بەکر شوانی



نووسەری تورک و براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات لە زۆر نووسین و دیمانەدا باس لەوە دەکات کە لە ساڵانی سەرەتای تافی لاوی و ساڵانی دواتردا کاتێکی زۆری بۆ خوێندنەوە تەرخان کردووە. بێگومان تەرخانکردنی کاتێکی زۆریش بۆ خوێندنەوە بە واتای خوێندنەوەی بڕێکی زۆر کتێبی بواری جیاواز دێت. چۆن ئەندازیار سەرەتا نەخشە دەکێشێت و پاشان دەست بە هەنگاوی کردەیی دەکات بۆ بنیاتنان، ئۆرهان پاموکیش، وەک خۆی زۆر جار ئاماژەی پێ داوە، پێش نووسینی هەر ڕۆمانێک نەخشەی ڕووداوەکان دەکێشێت، پاشان کەرەستەی پێویست بۆ نووسین (خوێندنەوەی زۆرترین کتێب سەبارەت بە ڕووداوەکانی ناو ڕۆمانەکە) دابین دەکات و ئەمجار دەست بە نووسین دەکات. من بەپێی سەرنج و تێبینی و دەستنیشانکردنەکانی خۆم کە زادەی خوێندنەوە و وەرگێڕان و بەدواداچوونی وردن، بۆم دەرکەتووە ئۆرهان پاموک بیرۆکەی چەند بەشێکی ڕۆمانی "بەفر"ی لە بیرەوەرییەکانی یاشار کەمال و مووسا عەنتەر وەرگرتووە و زۆر زیرەکانە بەکاری هێناوە. لەبەر ئەوەی ئەم وتارە تایبەتە بە مووسا عەنتەر، لای خوارەوە ئاماژە بۆ وەرگرتنەکانی ئۆرهان پاموک لە یاشار کەمال ناکەم و تەنیا تیشک دەخەمە سەر دوو ڕووداوی ناو ڕۆمانی "بەفر" کە هاتنیان بەو شێوەیە لە ڕۆمانەکەدا بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە بۆ ئەوەی کە کتێبی بیرەوەرییەکانی مووسا عەنتەر یەکێک لە کەرەستەکانی نووسینی ڕۆمانەکە بووە.

**ڕووداوی یەکەم:**

**سەردانی مووسا عەنتەر بۆ خانەقای شێخ مەعشووق لە دیاربەکر (ڕاستی):**

شێخ مەعشووق کوڕی شێخ مەعسووم گەورەی شێخەکانی نۆرشین بوو. ئەم بنەماڵەیە بە نزیکایەتییان لە دەوڵەتی تورکەوە ناسرابوون، بۆیە مووسا عەنتەر ساڵی 1958 لە ڕۆژنامەی "ئیلەری یورد"دا ڕەخنەی زۆری لێ دەگرێت. شێخ مەعشووق چەند جارێک دەرویش و موریدەکانی دەنێرێت بۆ دەرمانخانەی شەرق کە هی د. یوسف عەزیزئۆغڵوو بووە و ئەو سەردەمە مووسا عەنتەر کاری تێدا کردووە و ئارەزووی شێخی پێ دەگەیەنن بۆ سەردانی خانەقا. مووسا عەنتەر سەرەتا ڕازی نابێت، بەڵام دواتر لەسەر داوای د. عەزیزئۆغڵوو ڕازی دەبێت و بەمجۆرە باسی سەردانی خۆی بۆ خانەقای **شێخ مەعشووق** دەگێڕێتەوە:

(کاتێک شێخ مەعشووق منی بینی، یەکسەر **هات و** لەسەر پلیکانەکان پێشوازیی لێم کرد. **دەستمی گرت** ماچمی کرد و منی لە دیوان **لە تەنیشت خۆیەوە دانیشاند**. دژبەرەکانم سەریان سووڕمابوو. **دوای کەمێک، تەنیا** بۆ من و شێخ چای و قاوە هات. **هەردووکمان** بە دەنگی بەرز و کەیفی سازەوە باسی مێژووی ئیسلام و ئەدەبیاتمان کرد. بانگی عەسر درا. شێخ گوتی: "مووسا بەگ گفتوگۆکەمان خۆشە، بەڵام، -وەک ئەوەی بڵێت بەداخەوە- کاتی نوێژە." منیش گوتم: "بە خۆشحاڵی، منیش بە دەستنوێژم و نوێژ دەکەم." کەیفی هاتێ و لە ڕیزی پێشەوە جێی بۆم کردەوە. نوێژمان خوێند. دیسان ڕووی لە من کرد و گوتی: "ماشاڵا، بەڵام کارێکی تریشمان هەیە." شارەزای سرووتەکانی ڕێبازی نەقشبەندی بووم، بۆیە پرسیم: "بەڕێزم، زیکرە؟" گوتی: "بەڵێ." منیش گوتم: "ئێ، منیش بۆ تەبەڕوک دێمە کۆڕی زیکرتانەوە." دیسان دڵی خۆش بوو و زیکرمان بە هەموو ڕێساکانییەوە بە ئەنجام گەیاند. سەرلێشێواویی موفتی و مەلا دەمارگیرەکان هێندەی تر زیادی کردبوو. دیسان سینییەکی پڕ لە میوەی نایاب بۆ من و شێخ هات. هەردووکمان بەدەم خواردنی میوەوە قسەمان دەرکرد. من



تەنیا لەبەر ڕقی ئەو دەمارگیرانە کاتەکەم درێژ دەکردەوە. کات گەیشتە دەمەو ئێوارە و شێخ منی تا بەر دەرگا بەڕێ کرد و نزای بۆم کرد.)

**سەردانی (کا) بۆ خانەقای شێخ سەعادەدین لە ڕۆمانی "بەفر"دا (خەیاڵ):**

لە ڕۆمانی "بەفر"ی ئۆرهان پاموکدا شێخ سەعادەدین ئەفەندی جەوهەر کە شێخێکی کوردە و لەسەر داوای موریدە ناشادەکانی ماڵی لە گوندێکی دووری ناو چیایەکانەوە بۆ قارس گواستووەتەوە، نامەیەک بۆ (کا) ی شاکەسی ڕۆمانەکە دەنێرێت و داوای لێ دەکات لە خانەقا سەری لێ بدات. (کا) سەرەتا دوودڵە، بەڵام پاشان لەسەر داوای ئیپەک و موختار و ئەوانی تر ڕازی دەبێت و دەڕوات بۆ سەردانی شێخ. پاموک دەنووسێت:

("کا" بە ماوەی چوار خولەک گەیشتە بەر دەروازەی خانەقای شێخ، دەرگای خانەقا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کرایەوە. کاتێک بە پلیکانە قیتەکاندا سەرکەوت، شیعری "پلیکانە"ی موختاری بیرکەوتەوە و هێشتا هەر لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا بوو. دڵنیا بوو لەوەی هەموو شتێک باش دەبێت، بەڵام خۆی وەک منداڵێک هاتە پێش چاو کە سوور دڵنیایە دەرزی لێ نادرێت، کەچی مل نادات بۆ چوونە ژوورەوەی تیمارخانەی پزیشک. لەگەڵ سەرکەوتنی بە پلیکانەکاندا، لە هاتنی خۆی پەشیمان بووەوە: سەرباری عەرەقخواردنەوە، ترسێکی قووڵ هەناوی هەژاندبوو. جەنابی شێخ دەستبەجێ و لەگەڵ بینینی "کا"دا، شوێنەواری ئەو ترسەی لە ڕوخساریدا خوێندەوە. ئەمیش حاڵی بوو شێخ هەستی بە ترسەکەی کردووە، بەڵام ئاکارێکی وا لە شێخدا هەبوو، ئەم شەرمی لە ترسەکەی خۆی نەکرد. لە ڕێڕەوی کۆتایی پلیکانەکەدا ئاوێنەیەکی چوارچێوە هەڵکۆڵدراو بە بزمار بە دیوارەوە داکوترابوو. "کا" سەرەتا جەنابی شێخی لەو ئاوێنەیەدا بینی. ماڵەکە زۆر پڕ و جەنجاڵ بوو، دەتگوت میوانەکان ماسین و لە قوتوودا ڕیز کراون. ژوورەکەیش بە هەڵمی هەناسە و گەرمایی مرۆڤەکان گەرم داهاتبوو. "کا" هەر هێندەی زانی وا خەریکە دەستی جەنابی شێخ ماچ دەکات. هەموو ئەمانە لە چاوتروکانێکدا ڕوویان دا، ئاپۆڕەی دەوروبەر و ناو ژوورەکە هیچ سەرنجی "کا"ی ڕانەکێشابوو. ئاپۆڕەیەکی بیست و چەند کەسی بۆ بەشداریکردن لە سرووتی سادەی ئایینی ڕۆژانی سێشەمە، بۆ گوێگرتن لە وتەکانی شێخ و بەیانکردنی دەردی دڵ لە ژوورەکەدا گرد ببوونەوە. ئەمانە بریتی بوون لە چەند کەسێکی خاوەن کارگەی شیرەمەنی، پیشەکاران، پێنج شەش کەسی چایچی، لاوێکی نیوەئیفلیج، بەڕێوەبەرێکی خێلی کۆمپانیای پاس و برادەرێکی، ئێشکگری شەوانی دامەزراوەی کارەبا، کابرایەکی ماوەی چل ساڵ دەرگاوانی نەخۆشخانەی قارس و چەند کەسێکی تر... شێخ، دوای ئەوەی دانە بە دانەی بێئۆقرەییەکانی لە ڕوخساری "کا"دا خوێندەوە، وەک ئەوەی ڕۆڵ بگێڕێت، دەستی ماچ کرد. ئەمەی بە جۆرێک کرد جۆری ئەوەی دەستی نازداری منداڵێکی ساوای ماچ کردبێت، نەک ڕێزی نواندبێت. "کا" سەرباری ئەوەی زۆر باش دەیزانی شێخ بەمجۆرە ڕەفتار دەکات، کەچی سەری سووڕمابوو. ئاگادار بوو لەوەی ئامادەبووان سەیریان دەکەن و بەوردی گوێیان لێ دەگرن، دەستیان بە قسان کرد.)

**بەراورد:**

1. گێڕانەوەکەی مووسا عەنتەر بیرەوەرییە و لە ڕاستیدا ڕوویداوە. / گێڕانەوەکەی ئۆرهان پاموک




خەیاڵی ئەدەبییە.

2. شێخ مەعشووق لە دیاربەکر پیاو بە دوای مووسا عەنتەردا دەنێرێت و داوای لێ دەکات لە خانەقا سەردانی بکات. / شێخ سەعادەدین ئەفەندی لە قارس نامە بۆ (کا) دەنێرێت و داوای لێ دەکات لە خانەقا سەردانی بکات.

3. مووسا عەنتەر سەرەتا دوودڵە و ڕازی نابێت، بەڵام دوایی لەسەر داوای د. عەزیزئۆغڵوو ڕازی دەبێت و دەڕوات. / (کا) سەرەتا دوودڵە و ڕازی نابێت، بەڵام دوایی لەسەر داوای ئیپەک و موختار و ئەوانی تر ڕازی دەبێت و دەڕوات.

4. شێخ مەعشووق لەسەر پلیکانەکان پێشوازی لە مووسا عەنتەر دەکات. / (کا) بەسەر پلیکانەکاندا سەردەکەوێت و دەچێتە ژوورەوە بۆ لای شێخ.

5. شێخ مەعشووق، مووسا عەنتەر ماچ دەکات. / شێخ سەعادەدین دەستی (کا) ماچ دەکات.

6. ئامادەبووان تێکەڵەیەکن لە پیشەکارانی شاری دیاربەکر و هاتوون زیکر بکەن و گوێ لە وتەکانی شێخ مەعشووق بگرن. / ئامادەبووان تێکەڵەیەکن لە پیشەکارانی شاری قارس و هاتوون زیکر بکەن و گوێ لە وتەکانی شێخ سەعادەدین بگرن.

7. مووسا عەنتەر و شێخ مەعشووق قسە و گفتوگۆ دەکەن. / (کا) و شێخ سەعادەدین قسە و گفتوگۆ دەکەن.

**ڕووداوی دووەم:**

**مووسا عەنتەر و ساڵح ئەفەندی (ڕاستی):**

ساڵی 1972 مووسا عەنتەر لەگەڵ نزیکەی 20 کەسی تردا لە دیاربەکر دەدرێنە دادگا. لەناو بەشدارانی ئەو دۆزەدا جگە لە شەرافەدین ئەلچی و ئەو، ئەوانی تر زمانی تورکییان نەزانیوە، بۆیە ساڵح ئەفەندی موفتیی ئەو سەردەمەی دیاربەکر لە لایەن دادگاوە وەک وەرگێڕ دەستنیشان دەکرێت. ساڵح ئەفەندی گوتەی ئەو هەژار و نەدارانە ڕێک دەخاتەوە و بە شێوەیەک وەریان دەگێڕێت کە زیانی بۆ کەسەکان نەبێت.




مووسا عەنتەر دەنووسێت:

(هەرگیز لەبیرم ناچێت، هاوڕێیەکمان بە ناوی محەمەد بە گرانی تووشی نەخۆشیی سیل ببوو. هەموو داخوازییەکانی ڕەت کرابوونەوە. ڕۆژێک محەمەد لە دانیشتنی دادگادا هەڵسایە سەرپێ و بە زمانی کوردی سووکایەتی بە دەوڵەت و حکوومەت و دادگا کرد. کاتێک دادوەر داوای لە ساڵح ئەفەندی کرد وتەکانی وەربگێڕێت، ئەو بە نزیکی بەمجۆرە وەری گێڕا: "بەڕێزم، من بێتاوانم. وەک دەبینن نەخۆشییەکی گرانم هەیە. خاوەنی ماڵ و منداڵم. تکا لە دادگای باڵاتان دەکەم ئازادم بکەن با لەناو ماڵ و منداڵی خۆمدا بمرم." دواجار دادگا

محەمەدی ئازاد کرد و بڕیاری دا پێویست ناکات لە دانیشتنەکانی داهاتووی دادگادا ئامادە بێت. پاشان ئێمەیش ئازاد کراین. دوای چوار یان پێنج ساڵ سەرم لە ساڵح ئەفەندی دا. لە هەلێکدا بە گاڵتەوە لێم پرسی: "خۆجەم، تۆ وەرگێڕی سوێندخۆر بوویت. چۆن بەو جۆرە وەرت گێڕا؟" ئەو بەم بەسەرهاتەی سەعدی شیرازی وەڵامی دایەوە:
لەنێوان شای ئێران و فەرمانڕەوای هندستاندا شەڕ دەقەومێت. شای ئێران بەسەر سوپای هندستاندا سەردەکەوێت و فەرمانڕەوا بە دیل دەگرێت. فەرمانڕەوا دەهێننە دامێنی تەختی شا و ئەم سەرزەنشتی دەکات و پێی دەڵێت بۆچی خۆی لە قەرەی کاری گەورە داوە و بیری لەم ڕۆژە نەکردووەتەوە. پاش ئەوەی وەرگێڕ قسەکانی شای ئێران بۆ فەرمانڕەوای هندستان وەردەگێڕێت، ئەم لە وەڵامدا دەڵێت: "بەدڕەوشتی مەکە! ئێمە لە دژی یەکدی شەڕمان کرد. هەر دەبوایە یەکێکمان ببەزین. ئێستا من بەزیوم و دیلی دەستی تۆم. پێویست بە جنێودان ناکات، چیت لە دەست دێت، درێغی مەکە." دوو وەرگێڕ لە نێوان شا و فەرمانڕەوادا ئەرکی وەرگێڕان بەجێ دەهێنن. شا داوایان لێ دەکات قسەکانی فەرمانڕەوای بۆ وەربگێڕن. وەرگێڕی یەکەم قسەکانی فەرمانڕەوای هندستان بەمجۆرە وەردەگێڕێت: "بەڕێزم، من دەمزانی هاوتای ئێوە نیم. بەڵام ناپاک و لێبووکەکانی دەوروبەرم هانمیان دا و منیش ئەو ملهوڕییەم کرد." شا ئەم قسانەی زۆر پێ خۆش دەبێت و فەرمانڕەوای هندستان دەبەخشێت. وەرگێڕی دووەم خۆی پێ ناگیرێت و هاوار دەکات: "گەورەم، فەرمانڕەوای هندستان وای نەگوت، بەڵکو سووکایەتی و جنێوی بەسەرتاندا باراند." شا لە وەڵامدا دەڵێت: "دە واز بێنە توخوا! درۆکەی ئەو لە ڕاستییەکەی تۆ زۆر باشترە. ئەو ژیانێکی ڕزگار کرد، تۆیش هانی ئەنجامدانی تاوان دەدەیت.
ساڵح ئەفەندی دوای گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە بەردەوام بوو و گوتی: "وەرگێڕانی من لەو دانیشتنەکەی دادگادا وەک ئەم بەسەرهاتە وابوو. دەمزانی سوێندەکەم دەشکێنم، بەڵام ئەو چاکەیەی کە پێم وابوو لەو ساتەدا ئەنجامی دەدەم، بەزیادیشەوە کەفارەتی ئەو گوناهەکەمە.)

**گفتوگۆی شینە و "کا" لە ڕۆمانی "بەفر"دا (خەیاڵی ئەدەبی):**

کەسایەتیی "شینە" کە لە ڕۆمانی "بەفر"دا ئاشنای دەبین، ئیسلامییەکی توندڕۆیە و زۆری مەبەستە "کا" ببینێت و بزانێت بۆچی بۆ قارس هاتووە. پاموک دەنووسێت:
(لەپڕ هەردوو شانی "کا"ی گرت، لە خۆی نزیک خستەوە، ڕوومەتەکانی ماچ کرد و پێی گوت: "تۆ دەروێشێکیت تەمەنی خۆت بە شیعر بەخشیوە. نابێت بە ئامێری ئەوانەی خراپە دەرهەق بە موسڵمانان و لێقەوماوان دەکەن. هەروەک چۆن من متمانەم بە تۆ کرد، تۆیش بە منت کرد و بەناو ئەم بەفرەدا هاتیت بۆ لام. دەمەوێت لەبری سوپاسکردن، بەسەرهاتێکی واتادارت بۆ بگێڕمەوە." بە ڕیتمێکی نیوە شانۆیی و نیوە ئاسایی نیگای بڕییە ناو چاوەکانی "کا" و گوتی: 'بیگێڕمەوە؟"... "بیگێڕەوە."
لە زەمانی زۆر کۆندا، لە ئێران قارەمانێکی بێهاوتا و شەڕڤانێکی ماندوونەناس هەبوو. هەمووان دەیانناسی و خۆشیان دەویست. با ئێمەیش وەک ئەو کەسانەی لەو سەردەمەدا خۆشیان دەویست، بڵێین ناوی ڕۆستەم بوو. ڕۆستەم ڕۆژێک لە کاتی

ڕاودا ڕێی لێ وێڵ دەبێت، کاتێک شەویشی بەسەردا دێت و خەوی لێ دەکەوێت، ئەسپەکەی ون دەبێت. بەدەم گەڕانەوە بە دوای ئەسپەکەیدا کە ناوی ڕەخش بوو، دەچێتە خاکی دوژمن، واتە وڵاتی توورانەوە. لەبەر ئەوەی ناوبانگی پێش خۆی گەیشتبووە ئەوێ، ناسرایەوە و هەڵسوکەوتێکی باشی لەگەڵ کرا. دوای نانخواردن دەچێتە ژووری حەسانەوە، لەو کاتەدا کچی شا دەچێتە کنی، ئەڤینی خۆی بۆ بەیان دەکات بۆی و پێی دەڵێت دەیەوێت منداڵێکی لێی ببێت. بە جوانی و زمانی لووسیی خۆی ڕۆستەم لەخشتە دەبات و پێکەوە دەنوون. بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ڕۆستەم قۆڵبەستێک بۆ ناسینەوەی منداڵەکەی بەجێدەهێڵێت و بۆ وڵاتی خۆی دەگەڕێتەوە. کوڕەکەی -ئەوان ناویان ناوە زۆراب و با ئێمەیش هەروا ناوی بهێنین- کاتێک دوای ساڵانێکی درێژ تێدەگات کوڕی ڕۆستەمی پاڵەوانی داستانە، دەڵێت: "ڕوو لە ئێران دەکەم، کەیکاوسی شای زۆردار لە تەخت دەهێنمە خوارەوە و باوکم دەخەمە جێی... پاشان دەگەڕێمەوە بۆ تووران، شا ئەفراسیابی شای زۆرداری توورانیش وەک کەیکاوس لە تەختی پاشایەتی دەهێنمە خوارەوە و خۆم تاجی پاشایەتی لەسەر دەکەم! ئەو کاتە ڕۆستەمی باوکم و خۆم، ئێران و تووران، واتە هەموو جیهان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بەڕێوە دەبەین!" ئەمە گفت و بیرکردنەوەی زۆرابی سادە و نیازپاک دەبێت، بەڵام هێشتا تێنەگەیشتبوو دوژمنەکانی چەند قرێژ و تەڵەکەبازن. شای تووران شا ئەفراسیاب سەرەڕای ئەوەی نیازی زۆرابی بۆ ئاشکرا دەبێت، بە بیانووی شەڕی دژ بە ئێران پشتیوانی لێ دەکات، بەڵام کۆمەڵێک سیخوڕ دەخاتە ناو سوپاوە بۆ ئەوەی نەهێڵن زۆراب ڕۆستەمی باوکی بناسێتەوە. دوای فرۆفێڵ، دەسیسە، گەمەی چارەنووسی بەد و ڕێککەوتە نهێنییەکانی یەزدانی پەروەردگار، ڕۆستەمی داستان و زۆرابی کوڕی دێنە مەیدانی شەڕ و ڕیزی سوپا لە پشتیانەوە ڕادەوەستێت. ئەمان لەبەرئەوەی زرێیان پۆشیوە، مەیدان لە یەکتری دەگرن و یەکدی ناناسنەوە. ڕۆستەم بۆ ئەوەی شەڕڤانی بەرانبەری فریا نەکەوێت هێزی خۆی کۆ بکاتەوە، بێ ئەوەی بزانێت کێیە، هەڵمەتی بۆ دەبات. زۆرابیش چاوەکانی لە دانانی باوکی لەسەر تەختی پاشایەتیی ئێران هیچ شتێکی تری نەدەبینی و باکی نەبوو لە بەرانبەر کێدا شەڕ دەکات. بەمجۆرە ئەم دوو شەڕڤانە دڵفراوان و گەورەیە، ئەم باوک و کوڕە، لە یەکتر دێنە پێشێ، شمشێر هەڵدەکێشن و سەربازەکانیش لە پشتیانەوە سەیریان دەکەن.)

**بەراورد:**

سالح ئەفەندی بە گێڕانەوەی **بەسەرهاتێکی کۆنی ئێرانی** هەڵویست و ئامانجی خۆی بۆ مووسا **عەنتەر ڕوون دەکاتەوە** / شینە بە گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی کۆنی **ئێرانی هەڵویست و** ئامانجی خۆی بۆ "کا"ی شاکەسی ڕۆمانی "بەفر" ڕوون دەکاتەوە

**سەرچاوەکان:**

- بیرەوەرییەکانم، مووسا عەنتەر، وەشانخانەی ئاڤێستا، ئیستانبول، 1999، ل: 93 – 95 و ل: 97 – 99. (بە زمانی تورکی.)
- ڕۆمانی بەفر، ئۆرهان پاموک، و. لە تورکییەوە: بەکر شوانی، ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە، چاپی سێیەم، 2016، ل: 186 – 188 و ل: 153 - 155.

**بەکر شوانی**

بەکالۆریۆسی ڕۆژهەڵاتناسی-بازنەی تورکیاناسی، زانکۆی بۆن، 2016

بەکالۆریۆسی زانستی نەوت و کانەکان، زانکۆی بەغدا، 1991



# زمان وەك سەنگەری دژەکۆڵۆنیالیزم

## لە هەوڵەکانی مووسا عەنتەردا

هیوا مووسا



**دەستپێک، یادەوەری**

بەرکەوتنی من لەگەڵ ناوی مووسا عەنتەردا دەگەڕێتەوە سەرەتای نەوەدەکان، ئەوکات لە گوندی "هۆڕێن" بووین، ئێواران دوای شێوان لە کاتژمێر حەوت هەمووومان لە چواردەوری ڕادیۆ مارکە فلێپسەکەی باوکم کۆ دەبووینەوە، باوکم وەک هەمیشە مەوجەکەی بادەدا، پاش خشەخش و دەنگێکی ناشاز و تێکەڵ، دەڕۆیشتە سەر دەنگی سافی ئەمریکا، ئیدی دەنگی هۆمەر و لارا و موئتەبەر شیرونی، لە ئەمریکاوە، ئۆقیانووسی ئەتڵەسی دەبڕی و بەناو شاخ و کێوە بەرزەکانی کوردستان و بەناو داربەڕووەکانی شاخی بەمۆدا، خۆیان دەکرد بە حەوشەکەی ئێمەدا. هۆمەر و هاوڕێکانی دەستیان دەکرد بە هەواڵ، ئەو ڕۆژگارە بۆ ماوەیەک باس باسی مووسا عەنتەر بوو، ناوەکە بۆ ئێمە غەریب نەبوو، چون باوکی ئێمەیش ناوی مووسا بوو، هەستمان دەکرد کەسێک کوژراوە، بەڵام دروست نەمان دەزانی چییە، ڕاستی ئێمە چاوەڕێی گۆرانییەکی "زیرەک، یان خالقی و ماملێ"مان دەکرد، باوکم دەیگوت ئەوە پیاوێکە کوردی تورکیایە کوشتوویانە. واتە مووسای باوکمان لە باشوور هەواڵی کوشتنی مووسا عەنتەری لە باکوور بۆ ڕوون دەکردینەوە لە زمانی هۆمەر دزەییەوە. ئەو ڕادیۆ مارکە فلێپسە، کە تەمەنی بیست ساڵ دەبوو، گەشتی ڕۆحی باوکم بوو، بە جۆرێک باوکم بە ئەو ڕادیۆوە هەموو ئێوارانێک گەشتێکی بە دەوری جیهاندا دەکرد لەناو ئەو گوندە قووڵ و شاراوەی بن زنجیرە شاخی بەمۆدا.

**بۆ دەبێت مووسا وەك چالاكوانێكی دژەكۆڵۆنیالیزمێك بناسێنین**

ڕەنگە قسەکردن لە دەرەوەی ئەدەبیاتی کۆڵۆنیالیزم، بەتایبەتیش خەباتی دژەکۆڵۆنیالیزم (داگیرکاری) نەتوانێت گرنگی ئەو هەوڵ و خەباتەی مووسامان بۆ بگوازێتەوە، بە جۆرێک وەک خەباتکارێکی ئاسایی بێتە بەرچاومان. بەڵام کاتێک لە ئەدەبیاتی ئەنتی کۆڵۆنیالزم و پۆست کۆڵۆنیالیزمەوە هەوڵەکانی مووسا دەخوێنیەوە، ئەوکات دەزانین ئەوەی مووسا کردوویەتی هەڵگیرسانی شۆڕشێک بووە دژ بە کۆڵۆنیالیزمی تورکی و هەر خۆیشی ڕابەرایەتی ئەو شۆڕشەی کردووە. لەم ڕووەوە ئەگەر تەماشا بکەین **هەوڵەکانی** مووسا لە کۆڕ و کۆبوونەوە و **ئاگادارکردنەوەی کورد** بۆ ئەوەی دەست بە زمان و **کولتووری خۆیانەوە** بگرن و لەباتی زمانی تورک **(داگیرکار)، زمانی کوری** بەکار بهێنن، لە هەوڵە **سەرەتاییەکانی فانوون دەچێت** کاتێک وەک پزیشکێک لە جەزائیر خەبات دەکات بۆ ئاگادارکردنەوەی جەزائیرییەکان؛ فانوون لە سەرەتادا بە کۆڕ و کۆبوونەوە و نووسینی دەیان بابەت و دواجار کتێبەکانی وەک ماسکی سپی و پێستی ڕەش، لەگەڵ چەوساوەکانی جەزائیر ئاگادار دەکاتەوە، هەتا ئەوەی دژ بە گوتاری ناتوندوتیژی گاندی دەوەستێتەوە و توندوتیژی دەکات بە دواچانس و ڕێگەیەک بۆ دەرچوون لە کۆڵۆنیالیزم. دەبینین مووساش لە ڕێگەی نووسینەکانی و دەرکردنی ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی کوردی، تەنانەت نووسینی شانۆنامەیەکی وەک "برینا ڕەش" هەم کۆمەڵگەی کوردی ئاگادار دەکاتەوە لە پرۆژەکانی داگیرکار، هەم داوایان لێ دەکات زمان و کولتووری خۆیان بپارێزن لە بەرانبەر کولتوور و زمانی داگیرکاردا.

کۆڵۆنیالیزم و گوتاری هەژموونی لە تورکیا ئەگەر چاوێک بە ئەدەبیاتی کۆڵۆنیالیزم (داگیرکاری) لە سەدەی پازە بەولاوەدا بخشێنین، دەبینین کە چۆن زمان ڕۆڵی خۆی گێڕاوە لەناو ئەو ئەدەبیاتەدا، بڕوانە ئەفریقا، لاتین ئەمریکا و هیندستان، بە جۆرێک داگیرکار بۆ ئەوەی بتوانێت گوتارەکەی خۆی **(دسکورسەکەی) پێشخات** دەبوو زمانی خۆی بەسەر ئەوانی تردا باڵا



و پیرۆز بکات. ئەویش لە ڕێگەی کۆمەڵێک میکانیزمەوە، کە دواتر گرامشی ناوی دەنێت میکانیزمەکانی (یان پێویستییەکانی) دیسکورسی هەژموونی. بە جۆرێک گرامشی باوەڕی وایە بۆ ئەوەی گوتارێک ببێت بە هەژموونی، ئەوا پێویستی بە سێ شتە، ئەوانیش: پەروەردە، دەوڵەت و میدیا.

ئەگەر بەوردی لە ئامانجەکانی ئەم سێ میکانیزمە ورد بینەوە، دەبینن سەرجەمیان کار لەسەر بەهەژموونکردن و باڵاکردنی زمانێک دەکەن لە بەرانبەر وێرانکردن و نابووتکردن و سڕینەوەی زمانی خەڵکە ڕەسەنە داگیرکراوەکەدا؛ ئەوەی لە ئەدەبیاتی پۆست کۆلۆنیالیزمدا ناو دەبرێت (ئیندیجینیەس(indigenous . کۆلۆنیالیزم/ داگیرکەر لە سەرێکەوە زمانی داگیرکراو دەکات بە زمانی دواکەوتوو، ناشرین، زیادە، ناپێویست، کەژی و نامرۆڤ، لە سەرێکیشەوە زمانی نەتەوەی داگیرکەر دەکات بە زمانی پێویست و پیرۆز. ئەگەر گرامشیانە بۆ ئەم ڕۆڵی دەوڵەت بڕوانین لە پرۆسەی داگیرکاری زمانی کوردی لە باکووردا، دەبینین دەوڵەتی تورکی لە سەرەتای دروستبوونییەوە ئەو ئەرکەی پێدەسپێردرێت کە زمانی تورکی دروست بکات، زمانێکی ستاندارد بکاتە بە بەرگی ئەو میللەت و دەوڵەتدا کە ناوی میللەتی تورک و دەوڵەتی تورکیایە. لەم ڕووەوە دەوڵەت لە ڕێگەی میکانیزمەکان و دامەزراوەکانییەوە کە لەبەر دەستیدایە دەستدەکات بەم پرۆسەیە.

ئیدی لە دوای دروستبوونی کۆماری تورکیاوە، پرسی سڕینەوەی کورد وەک نەتەوەیەک لەناو ئەو کۆمارەدا دەبێت بە دواپرسی ئێتنیک و نەتەوەکان، ئەمەش دوای کۆمەڵکوژی ئەرمەنەکان و دەرکردنی یۆنانییەکان لەسەر دەریای ناوەڕاست و دواتریش دەرکردنی پۆنتییکەکانی سەر دەریای ڕەش. بەڵام ئەوەی جیاوازیی نێوان دۆزی کورد و نەتەوەکانی تره ئەوەیە، کە کوردەکان جیاواز لە ئەرمەنی و یۆنانی و پۆنتۆکەکان خاوەن جواگرافیایەکی تر نین هەتا بۆی بچن، بۆ نموونە ئەرمەنییەکان، ئەوانەی کە ڕزگاریان بوو و ڕۆیشتن بەرەو ئەو خاکەی کە ئێستا پێی دەڵێن ئەرمینیا، یۆنانییەکان و پۆنتۆسەکان پاش کۆمەڵکوژی و دەرکردنیان، دواتر ئەوەشی کە مایەوە بەپێی ڕێکەوتنێک لەنێوان یۆنان و تورکیادا لەگەڵ تورکەکانی نیشتەجێی یۆناندا ئاڵوگۆڕیان پێکرا، ئیدی پرسی ئەو نەتەوانە بەتەواوی کۆتایی هات لە تورکیای نوێدا، بەڵام کوردەکان تەنها ئەو جوگرافیایان شک دەبرد کە لە سەری دەژیان، لەبەر ئەوە هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ئەو نەتەوەیە بۆ کۆمار، دۆخەکەی قورستر و ئاڵۆزتر کردبوو، چون دەبوو نەتەوەیەک لەناو خۆی و لەسەر خاکی خۆی کۆتایی پی بهێنێت، لەبەر ئەوە لە پرۆسەی سڕینەوەی نەتەوەی کورددا تەنها خودی فیزیکی کۆتایی بە کێشەکە ناهێنێت، لەبەر ئەوەیە سڕینەوەی فەرهەنگ، زمان، کولتوور، چاند، مێژوو دەبێتە پرۆژە لە لایەن دەوڵەتی تورکەوە. حوسین تاهیر لە نووسینێکدا ئەمە ناو دەبات بە جینۆسایدی کولتووری، ئەگەرچی هەتا ئێستا نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر پێناسەیەکی گشتگیر و دروست لەسەر جینۆسیادی کولتووری ڕێک نەکەوتوون، بەڵام لە جاڕنامەی مافی مرۆڤدا ئاماژەگەلێک هەن لەو بارەوە کە باس لە مافی خەڵکانی ڕەسەن دەکات و وشەی جینۆسیادی کولتووری بەکارهێناوە.

**جینۆسایدی کولتووری**

یەکەم کەس کە پێناسەی جینۆسایدی کولتووری دەکات ڕافائیل لمکنە، ئەو باوەڕی وایە کە جینۆسایدی

کولتووری سڕینەوە و وێراکردنە. جینۆسایدی کولتووری بریتییە لە ڕێگریکردن لە بەکارهێنانی زمانی گرووپێک، لە ژیانی ڕۆژانە و قوتابخانەدا، هەروەها ڕێگریکردن لە بەکارهێنانی کتێبخانە، مۆزەخانە، قوتابخانە، مۆزەخانەی مێژوویی، شوێنی نوێژکردن و هەر ناوەندێکی تری کولتووری. جینۆسایدی کولتووری وەک ڕافایل لمکن دەڵێت: دەکرێ لە کاتی شەڕ و ئاشتیشدا ڕوو بدات. داگیرکەر باش دەزانێت کە زمان تەنها وەسیلەی گواستنەوە نییە لەنێوان مرۆڤەکاندا، بەڵکو ئەو ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی خۆت، جوگرافیاکەت، زیندووهێشتنەوەی فەرهەنگ، زمان ئەو شوێنەیە وەک هایدگەر دەڵێت کە ئێمە وەک ماڵێک نەشونما دەکەین تێیدا، ئەو ماڵی بوونە، مرۆڤ لە ڕێگەی زمانەوە دەتوانێت خۆی بە ئەوانی تر بناسێنێت و وەردەرخات. لەبەر ئەوەیە کۆلۆنیالیزمی تورکی بە باشی درکی ئەوەی کردووە کە ئەگەر بێت بیانەوێت کۆتایی بە دۆزێک بهێنن بە ناوی کوردەوە لە تورکیا، ئەوا دەبێت زمانەکەیان لێوەرگرینەوە. لەم ڕووەوە چەند بڕیارێک دەدرێت. بۆ نموونە:

لە ١٩٢٤/٣/٣ موستەفا کەمال بڕیاریدا بە ڕێگریکردن لە بەکارهێنانی زمانی کوردی، ڕێگریکردن لە خوێندن بە زمانی کوردی، هەموو بڵاوکراوەیەک بە زمانی کوردی قەدەغە کرد.

دوابەدوای ئەم بڕیارە سەرۆک وەزیران عیسمەت ئینەنوو بڕیاردا و گوتی: کە ناسیۆنالیزم کلیلی پێکەوەبەستن و پێکەوەگونجانی کۆمەڵایەتییە لە تورکیا، تەنها تورکەکان دەتوانن قسە بکەن لە تورکیا، مەبەستی ئەوە بوو کە دەبێت هەموو بە تورکی قسە بکات و ببێت بە تورک، هەموو دانیشتوانی تورکیا دەبێت ببن بە تورک و ئەوەشی ئەم یاسایە قبووڵ نەکات دەبێت لەناو ببرێت.

نووسەرە کوردەکان ناچار کران، بە جۆرێک کە دەبوو بە تورکی بنووسن، خێزانە کوردەکان ناچار دەکران لە ماڵەوە بە تورکی قسە بکەن، لەم ڕووەوە زۆربەی کوردەکان بۆ ئەوەی ژیانیکی [illegible] لە زمانی خۆیان دەکرد. جەمیل بایک هوسەروکی ئێستای کەجەکە و کەسی یەکەمی پەکەکە، چیرۆکێک دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ساڵێک، کۆتایی حەفتاکان بوو، لە ماڵی ئێمە کۆبوونەوەیەک هەبوو لەگەڵ هەشت هەڤاڵدا، کە سەرقاڵی دروستکردنی پەکەکە بووین، باوکم هاتە ژوورەوە و گوتی جومعە (بایک) سەرقاڵی چیت، دەتەوێ حیزب دروستکەیت و کوردایەتی بکەیت؟ کوڕم بڕۆ زمانی تورکی فێربە، ببە بە تورک بۆ ئەوەی ژیانێکی شایستەت دەستکەوێت و بژیت، بۆ ئەوەی نەمری لە برسا.

**مووسا عەنتەر بەگژ زۆنی نەبووندا دەچێتەوە**

فانوون لە کتێبی پێستی ڕەش و ماسکە سپییەکاندا، باس لە دۆخێک دەکات کە داگیرکراو تێیدا، سەر بە زۆنی نەبوونە، بە ڕای فانوون لە ئەدەبیاتی کۆلۆنیالیزمدا جیهان یەک زۆنە، ئەویش زۆنە بۆ پیاوی سپی، بە جۆرێک کەسی ڕەشپێست لەو زۆنەدا نییە. ئەو زۆنێکی نییە تێدا بژی، بەڵکو ئەو تەنها خزمەتکاری پیاوی سپییە لە زۆنی سپیدا. کورد لە تورکیا لەم دۆخەدا بووە، کە وەک بوویەک نەدەکرا بژی، فانوون باوەڕی وایە کە ئەم زۆنە کۆتایی هەموو شتێک نییە، چون ئەم زۆنە وا دەکات کەسی ڕەشپێست دەست بکات بە شۆڕشکردن، ئەگەر ئەم دۆخەی ڕەشپێست بگوازینەوە بۆ دۆخی کورد لە تورکیا، ئەوا درکی ئەوە دەکەین کە چۆن زۆنی پیاوی تورک، دەبێتە سەرهەڵدانی شۆڕش و بەرگری لە ڕۆح و کەسایەتیی مووسا عەنتەردا، ئەوە تەنها زۆنی پیاوی تورکە، مووسا وەک شۆڕشگێڕێکی ڕادیکاڵ ناچار دەکات لە بەرانبەر ئەو زۆنەدا دەست بە جووڵە و شۆڕش بکات، کە زمانی ئەوی قبووڵ



**نییە، مووسا دەیەوێ لە ڕێگەی زمانەکەیەوە بڵێ نابێت تەنها یەک زۆن هەبێت، ئەو زۆنەش تەنها** بۆ زمانی ئێوە و کولتوور و فەرهەنگی ئێوە بێت، بەڵکو دەبێت زمانی ئێمە و کولتوور و فەرهەنگی ئێمەیش لەناو ئەو زۆنەدا جێگەی بێتەوە، ئەگەر بڕیارە زۆنێک هەبێت ئەوا دەبێت بۆ هەموان بێت. کۆی تێکۆشان و هەوڵی مووسا لە ئەم **بوارەدا چڕ بووەتەوە، بە جۆرێک ئەو دەیەوێ بە داگیرکەر بڵێ ئەوەی تۆ نکۆڵی لێ دەکەیت ئێمە بەرگری لێ دەکەین و دەیپارێزین، ئەو زمانەی تۆ بە نەبوو ناوی دەبەیت،** ئێمە جگە لەو زمانە زمانێکی تر شک نابەین بۆ تێگەشتن و گفتوگۆ. لە یادداشتەکانیدا، چەندین چیرۆک لەپشت ئەو هەوڵەی مووساوە دەبینین، بۆ نموونە ئەو لە دادگادا زۆری لێ دەکەن بە تورکی قسە بکات و ئیفادە بدات، چون دەوڵەت تەنها یەک زمان دەناسێت، ئەویش زمانی تورکییە، بەڵام مووسا سوورە لەسەر ئەوەی بە کوردی ئیفادە بدات، هەتا دادگا ناچار دەکەن کە وەرگێڕێکی کوردی بۆ بهێنن، ئەمە ئەو هەوڵە دژەداگیرکارییەیە (دژەکۆلۆنیالیزم)، کە فانوون باسی دەکات و باوەڕی وایە، کە کەسی داگیرکراو لەناو زۆنی نکۆڵیلێکراودا هۆشیار دەبێت و دەست بە شۆڕش دەکات. مووسا بەمە ناوەستێت، لە ڕۆژنامەکەیدا بە کوردی و تورکی بڵاو دەکاتەوە، ئەو زمانەی کە نکۆڵی لێکراوە، کەچی مووسا دەیخاتە سەر پەڕەی ڕۆژنامەکان.

**زمان وەك سەنگەری دژەکۆلۆنیالیزم**

ئەگەرچی مووسا ماوەیەکی کەم پەیوەندی دەکات بە پارتی کۆمەنیستی تورکیاوە، بەڵام ئەو زیاتر خۆی بۆ پاراستنی زمانی کوردی تەرخان دەکات، قورسایی مووسا لەسەر زمان و فەرهەنگی کوردی کەوتووە. مووسا باش درکی ئەوەی کردووە کە بۆ مانەوەی نەتەوەیەک، خەباتی فەرهەنگی هێندەی خەباتی چەکداری ڕۆڵی گرنگی هەیە.
لەو قۆناغەدا مووسا عەنتەر وەک ڕۆشنبیرێک بە باشی درکی بە گرنگی زمانی کوردی کردووە، بەئاگا بووە لەوەی کە کارکردن لەسەر سڕینەوەی زمان چەند گرنگ بووە بەلای کۆلۆنیالیزمی تورکییەوە، دەکرێ ئەم ئاگاییەی مووسا لەسەر ڕۆڵی زمان چ لای داگیرکراو و داگیرکار (کۆلۆلۆنیالیزم و کۆلۆنیکراو) بەهۆی نزیکی لە بنەماڵەی بەردخانییەکان و بەتایبەت لە کامەران بەدرخانەوە بوو بێت، چون بەدرخانییەکان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە پارێزگاریکردن و مانەوەی زمانی کوردی، ئەم نزیکییەی مووسا دەکرێ هۆکارێکی بنەڕەتی بووبێت کە مووسا زووتر دەستی بگات بە کتێب و زانیاری و ڕووداوەکانی دنیای دەرەوە. لەم ڕووەوە دەکرێ عەنتەر ئاگاداری ئەدەبیاتی کۆلۆنیالیزم بووبێت لە ئەفریقا. مووسا لە مێژووی کۆلۆنیالیزمەوە فێربووە کە ئەگەر بێت و زمانی تورکی بێت بە زمانی ناچاری و کوردەکان ناچار بکرێن زمانەکەیان لە بیر بچێتەوە، ئەوا بەئاسانی داگیر دەکرێن و پرۆسەی سڕینەوە و تواندنەوەیان پێشتر دەکەوێت، هەمان دۆخی ئەفریقا بەسەر کورددا دێت، لەبەر ئەوەبوو کە پاراستنی زمانی کوردی گرنگترین ئەرکێک بووە بەلای مووسا عەنتەرەوە.

**پێشاندانی جیاوازی وەك چەكی مانەوە**

هەوڵەکانی مووسا لە بواری دژەکۆلۆنیالیزمدا لە هەندێ شوێندا ئاستی زمانی تێپەڕ کردووە و هەوڵی داوە لە زۆر ڕووەوە بەتایبەت لە ڕووە فەرهەنگی و کولتوورییەکەشەوە، ئەو ئارگومێنتە بخاتە پێشەوە کە کورد لە ئەوانی تر ناچێت، ئەو

نەک تەنها زمانێکی تایبەت بە خۆی هەیە، بەڵکو کولتوور و ڕوانینێکی تایبەت بە خۆیشی هەیە، مووسا زۆرجار ئەم شەڕە تەنها لە ئاستی دەوڵەتی تورکدا ناکات، بەڵکو مەیدانەکە دەگوازێتەوە بۆ ئاستێکی سەرووتر لە دەوڵەت، ئەویش ئاستی دین و نەتەوە موسڵمانەکانە، لەم ڕووەوە عەنتەر لە ئارتیکەڵێکیدا کە لەسەر کۆمەڵێک ژنی کوردە لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان، هەوڵدەدات لە ڕێگەی دەرخستنی جیاوازیی ژنی کوردەوە ئەوە دووپات بکاتەوە کە ئەم نەتەوەیە نەک زمانەکەی، بەڵکو خاوەن ئەخلاق و کولتوورێکی تایبەت بە خۆیشیەتی، کە تێیدا ژنەکانی لە ژنی عەرەب و تورک و فارس و تەواوی میللەتانی موسڵمان ناچن، ئەویش لەو یەکسانییە جێندەرییەدا خۆی دەبینێتەوە کە لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا هەیە، کە تێیدا ژنەکان وەک پیاوەکان مافی خۆیان هەیە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و پێگە کۆمەڵایەتیەکەیانەوە. یەکێک لەو میکانزیمانەی بەردەوام کۆلۆنیالیزم کاری لەسەر دەکات، ئەویش زاڵکردنی گوتاری نەتەوەی باڵادەستە، وەک لە سەرەوە لای گرامشی ڕوونمان کردەوە. بەڵام مووسا دێت لە ئارتیکەڵێکیدا لەسەر چەند ژنێک ئەو گوتارە تێک دەشکێنێت کە دەیەوێ ژنی تەواوی موسڵمان وەک یەک ببینێت و جیاوازییە کولتوورییەکان بسڕێتەوە. لێرەدا هەوڵدەدەم ئەو چەند دێرەکەی کە لە وتارەکەی مووسا عەنتەر خۆیدا هاتووە لەسەر پێشاندان و خستنەڕووی ژنی کورد وەک بوونێکی یەکسان و خاوەنکەسایەتی لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا وەربگێڕم و دایبنێم، بۆ ئەوەی ئەوە بزانین کە مووسا عەنتەر چۆن دەیەوێ لە ڕێگەی پێشاندان و جیاوازیی ژنی کورد لە کۆمەڵگەی کوردیدا لەوانی تر جودا بکاتەوە، بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییە بەجێ نەهێڵێت بۆ کۆلۆنیالیزم (داگیرکار)، هەتا بە گوتاری هەژموونی خۆی پڕی بکاتەوە و گوتاری داگیرکاری خۆی بچەسپێنێت لە ڕووی دینەوە.

سەرەتا مووسا عەنتەر ئارتیکەڵێکی کورت لەژێر ناونیشانی "پێگەی ژنی کورد لە مێژووی کو[illegible] دەکاتەوە، کە لەو ئارتیکەڵەدا مووسا باس لە یەکسانی نێوان ژن و پیاو دەکات لەناو مێژووی کۆمەڵی کوردیدا. عەنتەر سەرەتای نووسینەکەی بەم ڕستەیە دەست پێ دەکات: "ئێمە لە کتێبە کۆنەکانەوە، لەناو ژنەکانی کوردەوە یەکسانی ژن و پیاو دەبینین". ئەو بەردەوام دەبێت و دەڵێت ئێمە ئەم یەکسانییە لەناو میللەتە موسڵمانەکانی تردا نابینین. ژنی کورد وەک ژنی ناو میللەتانی تر نەبووە. ئەوان بەزۆر ڕووبەڕووی پۆشینی سەرپۆش نەبوونەتەوە و لە ڕووی پێگەی کۆمەڵایەتیەوە لە پیاو جیا نەکراونەتەوە، **جگە لەو کەمە ژنەی کە سەر بە چینی فیوداڵە ئەرستوکراتییەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا پیاوی کورد فرەژن نەبووە. لەو جۆرە پیاوانە نەبووە کە کەسایەتییەکەی فرەژنی هەبێت.** تەنانەت لە ڕووی جەنگاوەری و شەڕیشەوە ژنەکان هاوشانی پیاوەکان جەنگاون، بەتایبەت جەنگ لەنێوان خێڵەکان و فەرمانڕەواکان ڕوودەدا، ئەوا ژنەکانیش چەکیان هەڵدەگرت و هاوشانی پیاوەکان شەڕیان دەکرد، هەندێ جاریش گوللە و کەرەستەی جەنگیان بۆ پیاوەکان لە بەرەکانی جەنگ دەبرد.

عەنتەر لە نووسینەکەیدا ئاماژە بە کۆمەڵێ ژن دەکات لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان، لەوانە: "عادیلە خانم لە هەڵەبجە"، هەروەها باس لە ژنێکی ناوچەی مێردین دەکات. بەناوبانگترینیان ئەو ژنەیە کە ناوی "پەریخان" بووە، سەرکردایەتی و ڕابەری خێڵی ڕامانی کردووە، هەتا کوڕەکەی گەورە بووە و توانیویەتی فەرمانڕەوای بکات. تەنانەت کوڕەکەشی کە بوو بە فەرمانڕەوا، هەر بە ئەمین پەریخانی بانگیان دەکرد. ئەمەش بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی پەریخان زیاتر لە پیاوەکەی ناوی بەناو خێڵەکەدا ڕۆیشتووە و ناوبانگی هەبووە.



یەکێکی تر لە ژنەکان شەمسی خاتوونە، کە لە هۆزی عومەریان بووە، کاتێک پیاوەکەی کە ناوی عومەر بوو، مرد، ڕاستەوخۆ بوو بە سەرۆکی هۆزەکەی، ئەویش سەرۆکهۆز بوو هەتا کوڕەکەی "موحەمەد" گەورەبوو و توانی دەسەڵاتی هۆزەکە بگرێتە دەست. ئەویش هەر بە ناوی موحەمەد شەمسییەوە ناوبانگی پەیدا کرد و ناسرا نەک بە ناوی باوکییەوە. یەکێک لە ژنەکانی دیکە فەسلە خانە، کە کە سەرۆکهۆزی تەمیکە بووە بۆ ماوەی چل ساڵ، هەتا لە ساڵی ١٩٦٣ مردووە، تەنانەت یەکەم ژن بووە کە بووەتە موختار، وەک موختار هەڵبژێردراوە لە تورکیا، چون هیچ پیاوێک وەک ئەو باوەڕپێکراو نەبووە.




**سەرچاوەکان:**

https://plato.stanford.edu/index.html

بیرەوەرییەکانم، مووسا عەنتەر، وەرگێرانی لە تورکییەوە: محەمەد عزەدین، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای فام، چاپی دووەم، هەولێر٢٠٢٢.



# وتووێژ لەگەڵ لاوێکی ٧٥ ساڵە

فرات جەوەری

گۆڕینی لە کرمانجیی ژوورینەوە: سەلاحەدین بایەزیدی

به درێژایی سەدەی ڕابردوو، ژمارەی ئەو کەسانەی لەناو کوردان هەڵکەوتوون، لە پەنجەکانی دەست تێناپەڕن. من بە منداڵی، دوو ناوم بیستبوو؛ یەکیان ئەدیب قەرەخان و ئەویتریان مووسا عەنتەر. هەردووکیان خەڵکی ناوچەکەی من بوون، لە خۆمان بوون، بەڵام وەک ئەفسانە وا بوون. لەناو شەوەزەنگ و تاریکیدا، دوو چروسکەی ڕۆناهی بوون. دەیانویست بە شەوقی خۆیان جڤات ڕووناک بکەنەوە.

ساڵانی هەرزەکاری، ئەودەمانەی منیش خۆم بە جیهانی کتێب سپاردبوو و دەستم بۆ نووسین بردبوو، ویستم شوێنپێی ئەم ڕۆشنبیرانە بگرم. دەمویست لە کۆڕی ئەوان دابنیشم و گوێ لە ڕاوێژیان بگرم. دەمویست بیانبینم و سەرەدەر لە فکری ئەوان دەربکەم. کە بەو تەمەنە گەیشتم، ئەدیب قەرەخان کۆچی دوایی کردبوو، بەڵام مووسا عەنتەر هەروا دەژیا. ئەویش بۆ ئەوەی کۆتایی بە تاسەکانی بهێنێ، لە ئیستانبوڵەوە ڕووی لە زێدی خۆی کردبوو و لە گوندێکی سەر بە نسێبین بە ناوی ستیلیل نیشتەجێ ببوو. هەنگین من لە نسێبینێ بووم، ستیلیل لە بنەپاڵەوە بوو. لە نووسینی دروشم لەسەر دیوارەکان وەڕەز ببووم، لە مشتومڕی فەلسەفەی ماتریالیست و پەیوەندی دیالەکتیک گیانەسەر ببووم، بیرۆکەی دیکتاتۆریای پرۆلیتاریا لە لای من درزی تێ کەوتبوو، وازم لە تێکۆشانی بێواتا بۆ دەسەلاتدارێتی تاکحزبی هێنابوو و گیرۆدەی نەخۆشی نووسین بە زمانی کوردی ببووم. لەوەشە نووسین بە کوردی منی وشیار کردبێتەوە و وای کردبێ هەست بە ڕاستیی خۆم بکەم. بۆیە ئاخروئۆخری ساڵانی هەفتا، لەگەڵ دوو هاوڕێی ترم، ڕوومان کردە ستیلیل بۆ ئەوەی سەرێک لە مووسا عەنتەر هەڵێنین؛ مووسا عەنتەرێک کە ئەودەم بەهۆی نووسینی شیعرێک بە ناوی "قمل" بووە ئامانجی هێرشان. لەبەر ئەم شیعرە، هەندێک دەیانویست لە گرتووخانەی بپەستێون و هەندێکیش داوایان کردبوو لە سێدارە بدرێ.

ڕۆژێک لە ڕۆژانی هاوین، کاتێک لە دەرگای مووسا عەنتەرمان دا و ئەو بە ڕوویەکی گەشەوە فەرمووی ژوورەوەی کردین، تۆزقاڵێک ناساغی لە ڕوخساریدا بەدی نەدەکرا. مووسا عەنتەر کە دوو – سێ وەچە لە ئێمە گەورەتر بوو، وەک ئەوەی هاوڕێی گیانی بە گیانیمان بێ، سەری قسەی لەگەڵ کردینەوە. جلوبەرگی، هەڵسوکەوتی، هەستان و دانیشتنیشی جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ هیی ئێمەدا نەبوو. بەڵام لە هەموو ڕوویەکەوە لە ئێمە بەئەزموونتر و دنیادیدەتر بوو. لە گوندێک هاتبووە دنیا، ژیانێکی پڕ کەندولەندی تێپەڕاندبوو، گەلەک کتێبی خوێندبووەوە، لەبەر خوێندنەوەی ئەم کتێبانە تووشی تەشقەڵە ببوو؛ کەوتبووە گرتووخانەوە، لە ئەستەنبوڵ لە تەک پیاوماقووڵی کورد و تورک هەڵسوکەوتی کردبوو، خۆیشی کەسێکی قورس و گران بوو؛ فێری ژیانی شارنشینی ببوو و بەو هەمووە ئەزموونەوە گەڕابووەوە گوند. دەیویست دوایین ساڵەکانی ژیانی، لە گوندەکەی، لە زێد و دەڤەری بیرەوەرییەکانی زارۆکێتی و لاوەتیدا تێپەڕێنێ.

بە دەم باسوخواسێکی دوور و درێژ لەگەڵ ئێمەدا، چێشتی بۆ لێ ناین. کاتێک چێشتەکە ئامادە بوو، لە حەوشە، لەسەر مێزەکەی دانا. دەتگوت لە شوێنێکی دوورەوڵات و لە باخچەیەکی ئەستەنبول یان لە ماڵێکی ئەورووپا دانیشتووین. بە کێرد و چەتاڵ، هەم نانمان دەخوارد و هەم قسەمان دەکرد. باخچەکەی بە دار و گوڵی ڕەنگین خەملابوو؛ جۆگەلەی ئاو و ماسی جۆراوجۆر ڕواڵەتێکی تایبەتیان بە باخچەکە

بەخشیبوو. مووسا عەنتەر وەک زانا و فەیلەسووفێک بە ناخی قساندا ڕۆچووبوو. کاتێک بیستی من بە کوردی دەنووسم، زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵام هاوکات دڵیشی بە من سووتا. بە ئەزموونەکانی خۆی ڕا دەیزانی لەبەر نووسینی بە کوردی بۆی هەیە چ بەڵایەکم بێتە سەر. بەڵام کاتێک پێم گوت ئامادەکاری بۆ چوونە دەرەوەی وڵات دەکەم، ڕەنگ و ڕووی کرایەوە. باسی سوێدی بۆ کردم. ژن و منداڵەکانی هەموویان لە سوێد نیشتەجێ ببوون، بەڵام ئەو وڵاتی بەجێ نەهێشتبوو. پێم وایە یەکەم جار ناوی ئەو وڵاتەم لە زاری مووسا عەنتەرەوە بیست کە پتر لە چل ساڵی تەمەنمی تێدا تێپەڕی. گوتی ئەگەر ڕۆیشتی، برۆ سوێد. لەوێ دەتوانی پەرە بە زمانەکەت بدەی و بە ئاسانی بنووسی. بە قسەم کرد و ساڵی ١٩٨٠ ڕووم کردە سوێد. لە سوێد زمانەکەی خۆم تیف تیفە دا و پێم نووسی. یەکەم جار، دوای دە ساڵ گەڕامەوە وڵات. لەم دە ساڵەدا کۆڵێک شتم نووسیبوو. دیسانەوە چاوم بە مووسا عەنتەر کەوتەوە. لەسەر ساڵانی ڕابردوو و ڕەوشی من قسەمان کرد. دەربارەی زمان و ئەدەبیات ئاخفین. پەسنی خەباتەکەی منی دا و زۆری دڵ پێ خۆش بوو. پاشان هەڤپەیڤینێکم لەگەڵ کرد و هەڤپەیڤینەکە لە ڕۆژنامەیەک بە ناوی کوردستان پرێسدا بڵاو بووەوە. ساڵی ١٩٩٢، کاتێک دەستم بە وەشانی گۆڤاری "نوودەم" کرد، مووسا عەنتەر دیسان پەریوەی ئەستەنبول ببوو. پێم گوت؛ ئاپێ مووسا، بەنیازین گۆڤارێکی ئەدەبی چاپ بکەین و دەمەوێ تۆ ببی بە یەکێک لە نووسەرە بەردەوامەکانی گۆڤارەکە. ڕێک ئەو ساڵە مووسا عەنتەر بوو بە ئامانجی گوللەی دڕندەکان و بەجێی هێشتین...

***

یەکەم جار کە چوومە ماڵی مووسا عەنتەر لە ستێلیل، ساڵی ١٩٧٨ بوو. لەو کاتەوە بەدوا، سەرسام بووم بە مووسا عەنتەر. جلوبەرگی، هەڵسوکەوتی، جموجووڵی، خاکەڕابوونی، هزر و ڕامان و بیرە پێشکەوتووەکانی کارتێکەرییەکی گەورەیان لەسەر من دانابوو. ئەودەم باسی ئەستێرەناسی، فەلسەفە، شارستانییەتی یۆنان، ئایینی زەردەشت و مێژووی مرۆڤایەتی کردبوو. بەڵام ڕۆمانسیبوونەکەشی شتێک نەبوو نەبینرێ. باخچە ڕازاوەکەی، دار و گوڵە جۆربەجۆرەکانی، جۆگەلە پڕ لە ماسییەکانی ناو حەوشەکەی، مووسا عەنتەری بە سەد ساڵ لە خەڵکی گوند دابڕیبوو. سەرەڕای ئەو هەمووە زانست و زانیارییەش، مووسا عەنتەر قەت خۆی لە خەڵکی گوند و مرۆڤەکانی ئەوێ جیا نەدەکردەوە؛ هاوبەشی دەرد و کوڵ، ئێش و برک و شین و شایی ئەوان دەبوو. سەد ساڵ لە پێش ئەوان بوو، بەڵام شان بە شانی ئەوان دەڕۆیشت.

ڕێکەوتی ٩ی تەمووزی ١٩٩٠، دوای سەرهەڵدانی نسێبین، من دیسان چاوم بە مووسا عەنتەر کەوتەوە. دوانزە ساڵی ڕەبەق دەرباز ببوون. لە شەست و سێ ساڵەوە ببووە هەفتا و پێنج ساڵ. من لە خەیاڵی خۆمدا مووسا عەنتەرێکی پیر، پەککەوتە، نەخۆش، دەردەدار و خەرەفاوم وێنا کرد. لێ وا نەبوو. ئەو لە هەموو ڕوویەکەوە لاو بوو، لاوێکی ٧٥ ساڵە...

لەبەر ئەوەی پێم وابوو ژیانی ئەو لاوە بەساڵداچووە بۆ هاووڵاتییەکانم سەرنجڕاکێشە، خۆمم پێ نەگیرا و لێم پرسی:

**فرات جەوەری:** ئەمڕۆ ناوی مووسا عەنتەر بە لای هەموو کوردێک و نەخوازە کوردانی تورکیاوە ئاشنایە... هەندێک کەس وەک نووسەر دەیناسن و هەندێک کەسیش وەک سیاسەتمەدار. تۆ چۆن خۆت دەدەیە ناساندن؟

**مووسا عەنتەر:** دەتوانم بڵێم کە من نووسەرێکی سیاسیم. ئەوەندەی لە دەستیشم هاتبێ، ویستوومە بە تەنز سیاسەت بکەم. چونکە هەتا ئێستا ئێمە هەلی ئەوەمان بۆ



نەرەخساوە بیروبۆچوونی خۆمان بە ڕاشکاوی و بێپەردە بێنینە زمان، ئەمنیش بۆ خۆم ڕێگەی تەنزم هەڵبژاردووە. نووسەری هیندیش وای کردووە. لافۆنتێنیش کاتی خۆی سیاسەتی فەرەنسای بە زمانی ئاژەڵان یانی بە فێبڵ ڕوون کردووەتەوە. مەردوومی من و دەوروبەرم کوردن؛ دنیاکەم کوردستانە. کوردستانیش پەرێشانە. پێم وایە ئەگەر کورد نەبوومایە، دیسانیش دەربارەی کوردان دەمنووسی.

**فرات جەوەری:** بێجگە لە خەباتی سیاسیت، من تۆ بە قمل، برینا ڕەش و فەرهەنگەکەتەوە دەناسم. بۆچی بە پێویستت زانی ئەم کتێبانە بنووسی؟ کێ تۆی خستە سەر ئەم ڕێیە؟

**مووسا عەنتەر:** ئەوەی ڕاستی بێ من جەنگاوەر نەبووم. سوپا و چەکوچۆڵیشم نەبووە. لەبەر ئەوەی نەمتوانیوە ناهەقی قەبووڵ بکەم، بە پێویستم زانیوە ئەم کتێبانە بنووسم. شاعیرێکی ئالبانی دەبێژێ: مرۆڤ تەنانەت ئەگەر لە بن پێیانیشدا بێ، دەبێ قسەی خۆی بکا و بڵێ وایە. ئەمنیش دیارە لاواز بووم، بە تەنێ بووم. عەیبە مرۆڤ باسی خۆی بکا، بەڵام دەتوانم بڵێم دوای کۆماری تورکیا من ئەم ڕچەیەم شکاند. پەژیوان نیم. تازە بە تازە، هاوڕێیانم گەیشتوونەتەوە من و هەیشن ئەوانەی کە وەپێشم کەوتوون. پیاو هەمیشە پێی خۆشە ڕۆڵەی خۆی لە خۆی باشتر بێ. ئێستا کە دەبینم لاوانی کورد وەها هەڵمەتێکیان دەست پێ کردووە، زۆر دڵخۆشم. لە سەردەمی ئێمەدا، لاوی خوێندەوار کەم بوون، دەتوانم بڵێم هەر نەبوون، لە نسێبین کەس نەبوو بچێتە قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەیی، تەنیا من هەبووم.

لەوە بترازێ، بەختم هەبوو کە بەشێکی زۆر لە ماڵباتەکەمان، ماڵی مامۆ و ئەوانم، هەر هەموویان لە بنخەت بوون. هاوینان دوای پشووی قوتابخانە، دەچوومە سووریا. لەوێ "هاوار" و "ڕۆناهی" دەردەکەوتن، ئەو گۆڤارانە و نووسەرەکانیان، کەسانی وەک جەلادەت بەدرخان، کامران بەدرخان، جگەرخوین، قەدری جان و عوسمان سەبری کارتێکەرییەکی زۆریان لەسەر دانام. ڕاستیت بوێ، نووسینیش سەرنجی ڕادەکێشام، بۆیەش دەستم پێ کرد و ویستم ئەو بۆشاییە پڕ بکەمەوە کە هەیە.

**فرات جەوەری:** وەک لە هەموومان ئاشکرایە، تۆ وەک نووسەرێکی چالاک لە زۆر گۆڤار و ڕۆژنامەدا کارت کردووە. دەکرێ بەکورتی باسی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە بکەی؟

**مووسا عەنتەر:** ئەزموونی من لەگەڵ وەشان و چاپ، ساڵی ١٩٤٨، لە ئەستەنبوڵ دەستی پێ کرد. ئەوسا گۆڤاری "دیجلە"م دەردەکرد. دوای داخستنی ئەمەیان، ساڵی ١٩٥٠ گۆڤارێکمان بە ناوی "کۆمەڵەی ڕۆژهەلات" چاپ دەکرد. دوای هەڵکردنی بای بەناو دیموکراسی، گەڕامەوە نیشتمان. لەوێش نەسرەوتم، لە دیاربەکر "پۆستەی ڕۆژهەلات"مان دەرکرد. چەند ساڵێک دوای ئەمە، دیسان بە مەبەستی سەربازی گەڕامەوە ئەستەنبول. دوای تەواوکردنی سەربازی و پاش گەڕانەوەم بۆ نیشتمان، لە ساڵی ١٩٥٨دا "ئیلەری یورت"مان دامەزراند. دوای دەرکردنی ئیلەری یورت، چاپخانەمان کڕی و دەستمان کرد بە وەشانی "میزۆپۆتامیا". دەرچوونی "میزۆپۆتامیا" بووە هۆی گیرانم. ساڵی ١٩٥٨ تا ١٩٦٠ لە گرتووخانەدا مامەوە. دوای بەربوونم، لەو گۆڤارەدا وتارم دەنووسی کە ئەحمەد عاکیف باشار لە ئەستەنبول چاپی دەکرد.

**فرات جەوەری:** باشە ساڵانێک بەسەر نووسینی ئەو

کتێبانە و هەروەها ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەدا تێدەپەڕێ کە تۆ کارت لەگەڵ کردوون. دەمەوێ بزانم بۆچی ماوەیەکی زۆرە هیچ بەرهەمێکت دیار نییە. هۆکار چییە؟ لەبەرچی نەتنووسیوە؟

**مووسا عەنتەر:** من لەم ماوەیەدا نووسیومە. زۆر کەسیش ئەمە دەزانن. چوار کتێبم ئامادەی چاپ بوون. هەر چوار کتێبەکەش لە لایەن پۆلیسەوە دەستیان بەسەردا گیرا. یەکێکیان فەرهەنگێکی کوردی – تورکی بوو. ئەویتریان کتێبێک بوو بە ناوی "حوجرەی ژمارە ٣٨". کتێبێکی تریشم هەبوو بە ناوی "دیاربەکر ئەو شەوە چەندە تاریک بوو". بیرەوەرییەکانی خۆیشم نووسیوە، ئەوانیش ئامادەی چاپن. هیوادارم بەم زووانە بکەونە بەر دیدی خوێنەرانەوە.
وەک دەبینی ڕانەوەستاوم، چیم لەدەست هاتبێ، دریغیم نەکردووە.

**فرات جەوەری:** بۆچی لە ئەستەنبول نەمایتەوە، بۆچی کەشوهەوای ڕۆشنبیریت بەجێ هێشت و گەڕایتەوە گوند؟

**مووسا عەنتەر:** لە نێوان سالانی ١٩٧٠ هەتا ١٩٧٥، بە گشتی سی و سێ مانگ لە گرتووخانەدا مامەوە. دوای بەربوونم، نەخۆش کەوتم و کەمێکیش ماندوو بووم. پێویستیم بە پشوو هەبوو. لە گوند ئاسوودە بووم. ئەم دۆخە تا ساڵی ١٩٨٧ بەردەوام بوو. لەو ساڵەوە بەدوا جارێکی تر سەرچۆپیم گرتەوە و دەستم بە نووسین کردەوە.
با چیرۆکێکی ڕۆستەمی زاڵ و باوکیت بۆ بگێڕمەوە. ڕۆستەم هێشتا منداڵ بوو، ڕۆژێک بابی بانگی دەکا و دەڵێ وەرە ڕۆڵە، دەسەڵاتەکەم و کاروبارەکانم هەمووی بە تۆ دەسپێرم. دوژمن بەمە دەزانن، هەڵدەکوتنە سەریان و ماڵ و حاڵیان تاڵان دەکەن. خەڵکی دەچنە لای ڕۆستەم و دەڵێن تاڵان کراوین. ڕۆستەم دەڵێ قەی ناکا، ئێمەیش ماڵ و حاڵی ئەوانمان بە تاڵان بردووە. پاش ماوەیەک خەڵک هاتن و گوتیان کوڕە دوژمن هەڵیانکوتاوەتە سەر خێمەکانی ئێمە و خەریکە بە سەرمانیدا برووخێنن، ڕۆستەم دیسان گوتی قەی ناکا، ئێمەش خێمەکانی ئەوانمان بەسەریاندا رووخاندووە. دواجار خەڵک هاتن و گوتیان کاکە دەستدرێژی دەکەنە سەر نامووسمان. ئەوسا ڕۆستەمی زاڵ هەڵچوو، گوتی ئیتر ئاوا نابێ، کوا ئەسپ و گورزم بۆ بێنن. ڕۆستەمی زاڵ خۆی هاویشتە سەر پشتی ئەسپەکەی و بە ڕق و قینەوە بەرەنگاری دوژمن بۆوە.
ئێمەیش لێیان داین، ئەشکەنجەیان داین، باوەڕ بکە خەڵکی گوندیان یەک بە یەک لە دارەکان بەستەوە و هیچ نەما بەسەریان نەهێنن، سووکایەتیان پێ کردین، منداڵەکانی ئێمەیان گرت، جەرگیان سووتاندین و ئێمە ورتەمان لێوە نەهات. تا وای لێهات ئیدی پیسایی خۆمانیان دەرخواردی خۆمان دا، دەستدرێژییان کردە سەر نامووسمان، شەرەفی ئێمەیان لەژێر پێ نا. ئەوجا من نەمتوانی لەوە زیاتر بەرگە بگرم.
من وەک ڕۆستەمی زاڵ گورزم نییە، بەڵام خۆ قەڵەمم هەیە. ئێستا پرم داوەتە قەڵەم و بە سەری پیری لە مەیدانی شەڕ ڕاوەستاوم.

**فرات جەوەری:** لەم مەیدانی شەڕەدا گەلەک لاویش ئەسپی خۆیان تاو دەدەن. تاوێک لەمەوپێش باسی نەوەی کۆن یانی نووسەرانی دەوروبەری "هاوار"مان کرد. ئەگەر نەوەی نوێ و نەوەی کۆن پێکەوە هەڵبسەنگێنی، چی لە نەوەی نوێ هەڵدەهێنجی؟ هیچ هیوایەکت بە نەوەی نوێ هەیە؟

**مووسا عەنتەر:** هی پێشوو هەم کەم بوون، هەم کۆن بوون، واتە کلاسیک بوون. بەڵام لاوانی ئێستا، یانی نەوەی نوێ مۆدێرنترن. چ نووسەر، چ شاعیر، دەبێ بەپێی کولتووری خۆی بنووسێ. ئەوانەی پێشوو، گەلەکیان پاشخانێکی قووڵیان نەبوو، لە قوتابخانە ئایینییەکاندا پێگەیشتبوون. فەقیرانە



نەدەگەڕان و دنیادیدە نەبوون. جگەرخوێن لە قامیشلۆکێ دەینووسی، ئێوە لە سوێد دەنووسن، جیاوازی لەوەدایە.

**فرات جەوەری:** ئەمڕۆ کەمتاکورتێ مرۆڤ دەتوانێ باسی کوردییەکی ستاندارد، یان ئەدەبیاتێکی کوردی بکا. وەک خۆشت دەزانی، ئێستا ئیتر بە زمانی کوردی ڕۆمان، شیعر، لێکۆڵینەوە و تەنانەت دەتوانم بڵێم دەقی فەلسەفیش دەنووسرێن. بەڵام زۆربەی ئەم خەباتە لە دەرەوەی وڵات دەکرێ. ئەمە چ ڕۆڵێک لە تێکۆشانی گەلدا دەبینێ و ئەگەر دەرفەتی ئەم خەباتە لە ناوخۆ هەبوایە، چ جۆرە پێشکەوتنێک دەهاتە گۆڕێ؟

**مووسا عەنتەر:** ڕۆڵی ئەم خەباتە بەنرخە قسەی تێدا نییە. چما کێ دەتوانێ بێ ئەم شتانە سەربکەوێ؟ ئەدەبیات یاخود نووسین، ڕێگەی تێکۆشان ڕووناک دەکەنەوە. بەڵام مخابن زمانەکەمان هێشتا هێندە پێش نەکەوتووە. زمانێک هەتا پێی نەنووسرێ، پێش ناکەوێ. ئێستا هەر کەسە و بە ڕاوێژی بنەماڵەکەی خۆی دەئاخفێ. نووکە ئەگەر ژنێک بێتە گوند و منداڵێکی ببێ، منداڵەکە وەک خەڵکی گوندەکە نا، بەڵکە وەک دایکی خۆی قسە دەکا. بۆیە زاراوەمان زۆر بووە و لێک دوور کەوتوونەتەوە. من لەسەر ئەو بڕوایەم ئەگەر زمانی کوردی پێی بنووسرێ، ئەم زاراوانە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر لێک نزیک دەبنەوە. ئێمە و زازا و سۆران دەتوانین بەئاسانی لێک بگەین و دەبێتە زمانێک. شتێکی تریش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کورد لە هەموو کەس زیاتر تینووی زانست و نووسینن. ئێستا ئەگەر یەکێکی تێر و یەکێکی برسی لەسەر سفرەیەک دابنیشن، چما وەک یەک نان دەخۆن؟ ڕەوشی ئێمەیش ئاوایە. ئەگەر کرمانجی ئازاد بێ، بتوانین چاپخانە و وەشانخانەی خۆمان هەبێ، بە ماوەیەکی کەم پێشەوبڕی جیرانەکانمان دەدەینەوە. من زۆر بڕوام بەمە هەیە.

**فرات جەوەری:** دەربارەی سیاسەتی ئێستای تورکیا چۆن بیر دەکەیتەوە؟ ئاستی وشیاربوونی کوردان چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

**مووسا عەنتەر:** لە تورکیا سیاسەتێکی حەکیمانە لە گۆڕێ نییە. ئەوەی هەیە قەشمەرییە. ئەوان خۆیشیان باش دەزانن ئیدی بە قەدەغە و گرتن و ئەشکەنجە بۆیان ناچێتە سەر. ئەوانیش ناچارن خۆیان بگۆڕن. لە لایەکی دیکەشەوە، ئێمەی کورد وشیار بووینەتەوە. من کاتی خۆی چیرۆکێکم بۆ گۆڤاری "سەرچاوەی دیجلە" نووسیبوو. ئەوکات گرتیانم، وەرگەڕانە سەروگوێلاکم، ئەشکەنجەیان دام، گوتیان هەتیو تۆ کێی، چ کارەی؟ سەرت پان دەکەینەوە. پاش ئەوەی بە هەزار حاڵ بەردرام، دیسان ملم لە نووسین نایەوە. کورتەچیرۆکەکەی من بەم جۆرە بوو: ژنێک و پیاوێک، منداڵێکی چوار – پێنج ساڵەیان هەیە. کرێکارن، ژن و مێرد نوستوون و منداڵەکەشیان لە شیرین خەو دایە. بەڵام کاتێک دز هەڵدەکوتێتە سەر ماڵەکەیان، منداڵەکە خەبەری دەبێتەوە. یەکێک لە دزەکان دەچێتە لای کوڕەکە، چەقۆکەی دەردەهێنێ و دەڵێ: "بە ئاستەم دەنگت لێوە بێ، دەتکوژم." دزەکەی تریش دەچێتە سک سندووقەکەی دایکی و هەموو دەفر و ئامانەکەی دەخاتە ناو توورەکەیەکەوە. کوڕەکە کسپەی لە جەرگی هەڵدەستێ، بەڵام فەقیرە دەتوانێ چ بکا، چەقۆیان لێ ڕاکێشاوە. بۆ ئەوەی دایک و باوکی بەخەبەر بێنێ، یەک بە خۆی دەڵێ: "ئاو، ئاو، ئاو!" یەکێک لە دزەکان دەڵێ: "وست بە کوڕە!" ئەویتریشان دەڵێ: "قەی ناکا پیاو، منداڵە،

ترساوە، کەمێکی ئاو پێ بدە." ئەویش قاپێک ئاوی پێ دەدا. منداڵەکە کە ئاوەکەی دەخواتەوە، دیسان بۆ ئەوەی دایک و باوکی بەخەبەر بێنێ، بە دەنگێکی بەرز دەڵێ: "ئۆخەی، ئۆخەی، ئۆخەی"، ئەوە یانی ئاوەکە چەند خۆش بوو. بەڵام دایک و باوک لە خەو هەڵناستن. دزەکە دەستی هەڵدەبڕێ و دەڵێ: "وست بە هەتیو! مستێکت لە دەمی دەدەم ها!" ئەوجا منداڵەکە بە دەنگێکی بەرز گاز دەکا و دەڵێ: "وەی دەمم! وەی دەمم! وەی دەمم!" هەنگێ دایک و باوکی کوڕە هەڵدەستن و دزەکان تێی دەتەقێنن.

منیش گوتم: "لاوە، دەزانم من وەک ئەو منداڵە وام، چەقۆم لەسەر سەری ڕاگیراوە، پێتان ناوێرم و دایک و باوکیشم خەوتوون. ئامانجی من ئەوەیە ئەوان لە خەو هەستێنم."

جا ئێستا دایک و باوک وشیارن، دڵم ئاسوودەیە. دز تەنیا هەڵاتنی بۆ ماوەتەوە. زوو یان درەنگ، دەبێ هەڵێن.

**فرات جەوەری:** ئامۆژگاریت بۆ خەباتکارانی بواری فەرهەنگی دەرەوەی وڵات چییە؟

**مووسا عەنتەر:** من زۆر گرنگی بە خەباتی ئێوە لە دەرەوەی وڵات دەدەم. تورکە لاوەکانیش لە ئەورووپا زۆر چالاک بوون. گاندی لە ئینگلیز و بن بێلا لە فەرەنسا خۆیان پێ گەیاند. هیوادارین ئێوەش ڕۆژێک بگەڕێنەوە، بە وڵاتەکەی خۆتان ڕابگەن و کاربەدەست بن.

نابێ قەت هیوابڕاو بن. مێژووی نەتەوەکان دوورودرێژە. ئەوەتا من تەمەنم بووەتە هەفتا و پێنج ساڵ، پەنجا و پێنج ساڵە لەناو ئەو خەباتە دام و بایی پووشێکیش بێهیوا نەبووم. ئەوەی ئێوە دەیکەن، زۆر بەنرخە. ڕەنگە ئێستا قەدرتان نەگرن، بەڵام ڕۆژێک دادێ، گشت ئەو شتانەی نووسیوتانن، وەک ئاڵا بە دەم باوە دەشەکێنەوە.

نسێبین، ١٩٩٠

**سەرچاوە:**

.Kurdistan press, hejmar 84, 26 îlon, 1990






# کۆترەباریکە

## قوبادی جەلیزادە

دڵنیام ئەمشەو

یا لە باشوور

یا لە ڕۆژهەڵات

یا لە باکوور

یان لە ڕۆژئاڤا

کوردێك خوێنی ڕژاوە.

سپێدە پەردەکەم لادا و ئەو پرسیارەم لە کۆترەباریکەکەی ڕۆخ پەنجەرەکە کرد؛

کێ شەهید کراوە؟

چاوی پڕ بوو لە فرمێسك، بە خەمگینی گماندی و

بە دەنووك لەسەر باڵی چەپی نووسی:

مووسا عەنتەر!



# دکتۆر چۆن دەبێت کورد بێت!؟

## هەوڵێک بۆ خوێندنەوەی شانۆنامەی «برینا ڕەش»

مووسا قەدەری وابوو کوردبێت و بۆ نەتەوە و زمانەکەی تێبکۆشێت، دواتر بەری ڕەنج و ماندووبوونەکانی لە کتێبێکدا چاپ و بڵاو بکاتەوە بە ناوی (بیرەوەرییەکانم). وەک خۆی لە پێشەکیی کتێبەکەیدا باسی دەکات، ئیلهامی نووسینی کتێبەکەی لە پێشەکیی فەرهەنگی (نوبەهارا بچووکان)ی (ئەحمەدی خانی) وەرگرتووە، کاتێک دەبێژێت:

**نە ژ بۆ ساحێب ڕەواجان**
**بەلکی ژ بۆ بچووکێن کورمانجان**

هەر لە زەمەنی منداڵییەوە باوکی کۆچی دوایی دەکات و بە ناچاری دایکی ئەرکی بەخێوکردنی منداڵەکانی دەگرێتە ئەستۆ. هەرچەندە لەو کاتەدا زمانی تورکی کێشەیەکی گەورە دەبێت بۆ دایک و ماڵباتەکەی، چونکە مەئمووری دەوڵەت و جەندرمە تێنەگشتنایە لەوەی چی دەڵێیت، هەموو شتێکیان خراپ دەکرد. بۆیە مووسا دەنێرنە بەرخوێندن هەتا لەو کێشەیە ڕزگاریان ببێت. مووسا تەمەنی چەند ساڵێک تێپەڕ ناکات شاهیدی بینینی ئەو ماڵباتە کوردانە دەبێت پەراگەندەی ناوچەکەیان دەبن، هەتا لە هێرشی سەربازانی تورک پارێزراوبن، چونکە لە ئەنجامی نووشستی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیراندا دەربەدەر بووبوون. تەنانەت پاش تەمەنی ٦٥ ساڵی مووسا گریان و گێرانەوەی ڕووداوەکە لە زاری نەنە خەجۆ لەبیر ناکات لە شۆڕشەکەدا، کە هاوسەر و دوو کوڕ و دوو زاوای لەدەست دابوو.

مووسا عەنتەر دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی تێبگەین و بزانین لەگەڵ چ دوژمنێکدا دەژین و دەستەویەخەین. یادەوەریی ئەو یادەوەریی پڕ لە کەیف و سەفا و خۆشڕابواردن نییە، بەڵکو یادەوەرییە لەگەڵ زمانی نەتەوەیەکی بندەست و گەلێکی ستەملێکراو بە درێژایی مێژوو.

یەکەم کێشەی مووسا عەنتەر زمانە و لە بیرەوەرییەکەشیدا بە یەکەم کێشەی دادەنێت. چی لەوە خراپترە ڕێگە نەدەن بە زمانەکەت بیر بکەیتەوە و گفتوگۆ بکەیت و ڕای خۆت دەربڕیت. یەکەم بوێری مووسا لە قوتابخانەی سەرەتایی بوو لە مێردین، مامۆستاکەی ئاوازێک دەژەنێت و لە قوتابییەکان دەپرسیت: «ئەرێ کەستان دەزانن سترانی ئەو پارچە مۆسیقایە چییە؟" من دەمزانی، بەڵام وەڵامم نەداوە، چونکە گۆرانییەکە کوردی بوو، ئەوساش لەناو شارەکان قسەکردن بە کوردی قەدەغەبوو، جا دەوڵەت هەر کەسێکیشی گرتبا کە بە کوردی قسە دەکا، بەرانبەر بەکارهێنانی هەر وشەیەک، لیرەیەک سزای بەسەردا دەسەپاند، بۆیە مێردین ببووە کەمپی کەڕ و لاڵان؛ لەبەر ئەوەی بە ئاشکرا نەیاندەتوانی قسە بکەن، بۆیە ناچار بۆ لەیەکگەشتن بە هێمای دەست لەنێوان خۆیاندا قسەیان دەکرد.»[١]

یەکێکی تر لەو ڕووداوانەی کاریگەریی لەسەر ژیانی مووسا عەنتەر دادەنێت شۆڕشی (سەید ڕەزای دەرسیم)ە. دواتر بە هێز و سوپا شۆڕشەکە دادەمرکێننەوە و لە بۆسەیەکدا سەید ڕەزا دەستگیر دەکەن و لە شاری (ئەلئازیز- ئەلازغ) لەسێدارەی دەدەن. ئەو کاتەی لە ئامادەیی دەخوێنێت دوو ڕووداو لە دەمی سەجادەدەین ناوێک دەگێڕێتەوە، کە ئەوکات پلەی ئەفسەر بووە لەناو سوپای تورکدا، سڵیان لە کوشتنی پیر و گەنج و منداڵ نەکردووەتەوە. تەنانەت پێیان خەسار بووە منداڵی کورد بە گوللە بکوژن و پارەی تێدا سەرف بکەن، بەڵکو لە شاخەوە بەریان داوەتە خوارەوە. مرۆڤ ئەو دێرانە لە بیرەوەرییەکانی مووسا دەخوێنێتەوە تا سەر ئێسقان ئازار دەچێژێت،

مووسا دەبێت چەند ئازاری چەشتبێ کە ڕاستەوخۆ لە زاری ئەفسەرەکەوە بیستوویەتی؟!

لەو ماوەیەی لە زانکۆ دەخوێنێت لە ڕێگەی هەردوو برا ئەحمەد قاسملۆ و حوسێن قاسملۆ ئاشنایەتی لەگەڵ عەبدولڕەحمان قاسملوو پەیدا دەکات و دەبێتە هاوڕێیەکی زۆر نزیکی. دواتر بە کامەران بەدرخانی دەناسێنێت و لە ڕێگەی ئەوەوە زەمالەی خوێندنی لە وڵاتی فەڕەنسا بۆ وەردەگرێت. ڕۆژێک لە ڕێگەی تەلەفۆن قسە لەگەڵ مووسا عەنتەر دەکات ئەم دێڕانە دەڵێت و دەبێتە هۆی دڵخۆشییەکی زۆر بۆ مووسا: «کوڕم خەمبار بووم بەوەی کە منداڵمان نابێ، بەڵام تۆ و عەبدولڕەحمان ئەو بۆشایەتان بۆ پڕ کردمەوە، ئێستا زۆر بەختیارم، گەر بمرم بەئارامی چاوان لێک دەنێم.»[٢]

ساڵی (١٩٥٨) دەبێتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد)، پێشتر کەس نەیدەتوانی بە کوردی لە ڕۆژنامە وتار بڵاو بکاتەوە، بەڵام مووسا بە کوردی لەسەر کێشەی کوردی دەنووسی. ئەمەش لای دەسەڵاتدارانی تورک جێگەی قبووڵکردن نەبوو، بۆیە هەرجارەو لە تیراژێکی نوێدا دادگا دۆسیەیەکی لەسەر مووسا عەنتەر دەکردەوە.

لە یەکێک لەو جارانە لەسەر زمان و کێشەی کوردبوون دەگیرێت، نزیکەی ٥٠ نووسەر و ڕۆشنبیر دەبن. نزیکەی سێ ساڵ بەند دەکرێن و لە یەکێک لەو ژوورە تاکەکەسیانەدا، کە مووسا ناوی ناوە حوجرەی ژمارە (٣٨)، لەسەر داوای هەڤاڵە بەندکراوەکانی، لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا شانۆی "برینا ڕەش" دەنووسێت. دواتر شانۆکە ناوبانگێکی جیهانی بەدەست هێنا و وەرگێردرایە سەر زمانەکانی هۆڵندی و دانیمارکی و بەلجیکی سویدی و چەندین زمانی تر.

نووسەر هۆکاری نووسینی شانۆنامەکە جگە لە داوای هەڤالان بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە، ساڵی ١٩٥٨ حوکمەتی تورکیا مانگی (چوار) گەنمی دەرمانکراو بۆ تووکردن بەسەر شێخ و ئاغای ناوچە کوردییەکاندا دابەش دەکات، لە کاتێکدا مانگی (دە) توو دەکرێت. ئەمەش وا دەکات گەنمەکە بەر لە وادەی تووکردن بەنرخێکی هەرزان بفرۆشنەوە بە خەڵکی **هەژار** و جووتیاری کورد و دەرخواردی خێزانی بدەن. دەرئەنجامی خواردنی گەنمی دەرمانکراو برینێکی ڕەشی لە جەستەی منداڵاندا دروست دەکرد و دەبووە هۆی مردنیان.

شانۆی "برینا ڕەش" لە چوار پەردە پێکهاتووە، وەک شانۆیەکی سیاسی دێتە ئەژمار.

شوێنی ڕووداوەکە، **گوندێکی بەگەکانە بە ناوی زارۆڤا،** لە دەشتی دیاربەکر.

شانۆکە باس لە خێزانی برۆ دەکات، **گوندییەکی هەژارە** وەک سەپان لەلای بەگی لادێکە کار دەکات. خێزانەکە پێک هاتووە لە برۆ: سەرۆکخێزان و زینۆ: هاوسەری برۆ و بەدۆ: کوڕی برۆ و زینۆ. بەدۆ خوێندکارە و بە مەبەستی خوێندن لە دێکە ڕۆیشتووەتە دەرەوە.






لە پەردەی یەکەمدا، پاش چند گفتوگۆیەک لەنێوان برۆ و زینۆدا، باسی هەژاری خۆیان و بابەتی خوێندنی کوڕەکەیان و گەنمی دەرمانپێوەکراو دەکەن.

کارەکتەری برۆ سەپانێکی نەخوێندەوارە و بڕوای بەوە نییە کوڕەکەی لە ڕێگەی خوێندنەوە بگاتە پلە و جێگەیەک لەژێریدا بحەسێتەوە. هەرچی زینۆیە بە حوکمی ئەوەی چەندین ساڵ لە ماڵ بەگی لادێ خزمەتی کردووە، لە زاری ئەوانەوە گرنگی خوێندنی بۆ دەرکەوتووە لە پشتی کوڕەکەی وەستاوەتەوە.

ئەگەر تەماشای بیرەوەرییەکانی نووسەر بکەین، دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە مووسا عەنتەر ئیلهامی شانۆییەکەی لە تێکەڵەیەک لە ژیانی واقیعی خۆی و خەیاڵ داڕێژاوە، چونکە ئەویش بەهۆی پێداگری دایکی لە سەرەتاوە بۆ ئەوەی زمانی تورکی

فێرببێت، نێردرایە بەرخوێندن، هەرچەند لە تەمەنێکی زوودا باوکی کۆچی دوایی دەکات، بەڵام ئەمە نابێتە گرفت بۆی و دایکی ئەو بۆشاییەی بۆ پڕ دەکاتەوە و لە پشتی دەوەستێت.

«من و خوشکی گەورەم و سێ برا بچووکەکەشم بەیەکەوە دەخەوتین، چونکە تەختەکەمان ئەوەندە گەورەبوو، جێگەی هەموومانی لێ دەبووەوە. بە شێوەیەک لە کاتی دروستکردنیدا شوێنی بێشکەی منداڵانیشی تێدا جیا کرابووەوە. لە کاتی نوستن هەموومان وەک جووجەڵە دەمانویست خۆمان بخەینە پاڵ دایکم. دایکیشم هەم بە میهرەبانییەوە دەستی بەسەر ئێمەدا دەهێنا و هەمیشە چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە و ناوە ناوە ئەستێرەکانی ئاسمانی پێدەناساندین.»[٣]

لە پەردەی دووەمدا بەدۆ لە قوتابخانە گەڕاوەتەوە و هەموو خێزانەکە بەتایبەت دایکی زۆر بەکەیفە. لێرەدا سێ کارەکتەر دێنە ناو شانۆیەکەوە، کە میوانی ماڵی برۆن، ئەوانیش مام سەعدۆ و کەلۆس و سارۆخانن. مام سەعدۆ لە دوو میوانەکەی دی شارەزا و دنیادیدەیە و کوڕەکە دەهێنێتە گۆ و پرسیاری خوێندن و ئەتۆم و چوونە سەر مانگی لێ دەکات و هەموان بە وەڵامەکانی برۆ خەنی دەبن.

لە پەردەی سێیەمدا دیسانەوە ماڵی برۆیە، خێزانەکە دانیشتوون، لەنێوان خۆیاندا گفتوگۆ دەکەن و میوانەکان دێنەوە و باسی خوێندن و پاشەڕۆژی بەدۆ دەکەن، کە کوڕە ببێتە ئەندازیار یان دکتۆر. پاشان باسی بەگ و دابەشکردنی گەنمە دەرمانکراوەکە دەکەن بەسەر خەڵکیدا.

لە پەردەی چوارەمدا، کە دوایین پەردەیە، بەدۆ خوێندنی تەواو کردووە و بووەتە دکتۆر و لە خانوویەکی جوان و نوێدا لە شاردا نیشتەجێن، برۆ هێشتا بڕوا بە چاوەکانی ناکات لە ڕێگەی خوێندنەوە کوڕەکەی گەشتووەتە ئەو ئاست و پایە. بیری دۆی سارد و ئەستوورکە گەرمی بەیانیان دەکات. ئەو ڕانەهاتووە هەموو بەیانییەک وەک بەیانیی جەژن سفرە بڕازێنرێتەوە و جلی وەک جلی بەگان بپۆشێت. «کچێ زینۆ من چیم لە تۆ کردووە؟ ئاخر چل ساڵە ئێمە سەپانی بۆ خەڵک دەکەین. ئاخر جاری وا هەبووە بە مانگیش لە گاجووتەکانم بترازێ، چڕوچاوی یەک بنیادەمم نەدەدیت. جاری وا هەبووە قسەشم بیر چووەتەوە. ئاخر لە "هۆ هۆ، وەخە هەڕە" زیاتر مێشکم نەدەچووە سەر وشەیەکی دی. ئەدی بە بیرت نایەت لە بەهاران، چەند ماندووبووم و شەوان خەو نەدەچووە چاوم؟ بەڕۆژیش نەدەهاتمەوە ماڵ، لە بەدۆ دووربێت، کوڕی گەورەمان کۆچی دوایی کردبوو. وەڵێ تا گەیشتمەوە گوند، ئێوە ئەوتان شاردبووەوە، یانی بێ ئەوەی ماڵئاوایی لێ بکەم لە گۆڕتان نابوو!»[٤]

نووسەر لە ڕێگەی برۆ وە وێنەی ژیانی سەپان و هەژاری گوندییە کوردییەکان نیشان دەدات، کە لە چ ڕەنج و ناڕەحەتییەکدان و لە ڕێگەی بە دۆشەوە کە دەبێتە نمایندەی نەوەی نوێی خوێندەوار و پێشکەوتوو، تەمەنای دواڕۆژێکی ڕوون و پرشنگدارییان بۆ دەکات. نووسەر لە بیرەوەرییەکاندا چەندجارێک ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە ئامانجی نووسینی ژیاننامەی خۆی بۆ ئەوەیە منداڵ و گەنج و نەوەی داهاتووی کورد هۆشیاربێت، بۆ ئەوەی ئەوەی بەسەریدا هات بەسەر ئەوانیشدا نەیەت و هۆشیار و ئاگاداربن.

پاشان لە دەرگای ماڵی برۆ دەدرێ و ژن و منداڵێکی نەخۆش دێنە ژوورەوە بە دوای ماڵی دکتۆرەوەن، دکتۆر بەدۆ دەرگا دەکاتەوە و ژنە داوای ئەوەی لێ دەکات بانگی دکتۆری بۆ بکات. چاوەڕوانی ئەوە نییە ئەو کوڕە گەنجە خودی دکتۆربێت. دواتر تێدەگا

خودی دکتۆرە، خەنسێ ئەو ژنەی کوڕە نەخۆشەکەی هێناوە بە سەرسووڕمانەوە دێڕێک دەڵێت مانا و دەلالەتی زۆر هەڵدەگرێت: «وەی لەو عەجایباتییەی! چۆن دەبێ دختور کورد بێ!؟»[5]

خەنسێ کاتێک دەبینێ دکتور پارەی چارەسەرکردنیش وەرناگرێت، دووبارە سەرسام دەبێت و دەڵێ ڕەنگە دڵی بە حاڵی هەژارم بسووتێت. بەدۆ کاتێک سەلۆ منداڵە نەخۆشەکە دەبینێت ڕابردووی خۆی بیردێتەوە و زینۆش کە خەنسێ دەبینێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژیانە تاڵەی پێشتر گوزەراندبووی. بەم فلاشباکە نووسەر دەیەوێ ئەوە بەبیر خوێنەری کوردزمان بهێنێتەوە کە خوێندن و خوێندەواری لە قۆناغێکەوە دەتباتە قۆناغێکی تر و دەرگای ژیانێکی تر بە ڕووی مرۆڤدا دەکاتەوە. جاران لە دێهاتەکاندا ئاغاکان نەیاندەهێشیت قوتابخانە بکرێتەوە، بۆ ئەوەی نەوەی جووتیار و سەپانی کورد وەک باوانیان دەربچن و خزمەتی نەوەکانی ئەوان بکەن.

نووسەر کۆتایی شانۆنامەکە بە ئیلهاموەرگرتن لە دێڕێکی خانی مەزن لە سەرەتای گێڕانەوەی بیرەوەرییەکاندا، دەڵێت: «هەموو دنیا بوونە حکوومەت و کوردییش ڕابوون.»

بەدۆش کاتێک منداڵان چارەسەر دەکات، کە بەهۆی برینی ڕەشەوە دەناڵێنن، دەڵێت: «خەڵکینە، ڕاستە ئێمە لەناو دەرد و کەسەر و خەم و مەینەتدا سووتاوین، وەلێ ئیدی کاتی خۆدەربازکردنییە.»[٦]

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا، یەکەم دەرگیربوونی نووسەر لەگەڵ زماندایە و هەر لەسەر زمانیشە زۆرکات ڕاپێچی دادگا کراوە. ئەو هەمیشە پێداگری ئەوە دەکات بۆ کەمەنەتەوەکانی تر لە تورکیا بە زمانی خۆیان ڕۆژنامە و گۆڤاریان هەبێت، بەلام بۆ کورد قەدەغە بێت؟

ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ شانۆنامەی ئەنتیگۆنەی سۆفۆکلێس بەر دێڕێک دەکەوین لە زمانی هایمۆنی دەزگیرانی ئەنتیگۆنەوە، کە بەرانبەر کریۆنی باوکی دەوەستێتەوە لەپێناو بەرگریکردن لە ئەنتیگۆنە و دەڵێت: «شارێک، کە بەتەنیا هەر هیی یەک کەس بێت، شار نییە.»[٧]

دەسەڵاتی فاشیستی تەنها ئەوە دەبینێت کە خۆی دەیەوێت و ددان بەو زمانەشدا دەنێت کە خۆی قسەی پێدەکات. ئەگەر تەماشای مێژووی سەد ساڵ زیادتری دۆخی کوردانی باکووری کوردستان بکەین، دەبینین، بە چەندان شێوە مافی زمان و **هاوولاتیبوونی لێ** سەندراوەتەوە و بە هەموو شێوەک **داپڵۆسێنراوە و لە** زمانی خۆی تەریک کراوە. **تەنانەت دوژمن بە ڕەوای** نەبینیوە تاکی کورد وەک **هەر مرۆڤێک گوڕ و مەکانێکی** هەبێت، بەتایبەت ئەو کوردانەی **بە ژن و منداڵەوە** دەست بەسەر دەکران **لە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران** و سەید ڕەزای دێرسیمدا، دەدران بەدەم ڕووبارەوە، یاخود لە شاخ و کێوەکانی کوردستانەوە هەڵدەدرانە خوارەوە. نووسەر لە نزیکەوە شایەتحاڵەکانی ئەم ڕووداوانە دەبێنێت ئاگرێکی کوردبوون لە ناخیدا دادەگیسێت هەتا کۆتایی تەمەنی ناکوژێتەوە.

کریۆنی دەسەڵاتداری تیبە قسەیەک دەکات لە بەرانبەر ئەنتیگۆنە، بۆ هەموو سەردەمەکان بەناو مێژووی هەموو دەسەڵاتدارەکاندا شۆڕ دەبێتەوە، دەڵێت: «دوژمن دوای مردنیش، هەر دوژمنە.»[٨]

ڕەنگە دەسەڵات بتوانێت بە سیاسەتی پەرتکە و زاڵبە جومگەکانی کۆمەڵگەی کوردی لە یەک دابڕێت، بەڵام بۆ زمانی نەتەوە شتێکی نامومکینە و ناکرێت.

لە ڕۆمانی (داگیرکردنی تاریکی)ی بەختیار عەلیدا، عیسمەت ئۆکتایی بەیانییەک لە خەو ڕادەبێت و دەبێنێت نە کەس لە خێزانەکەی لە زمانی ئەو تێدەگەن و نە ئەویش لە زمانی ئەوان تێدەگات. هەر وەک گریگۆر سامسای کافکا، سەرلەبەری ژیانی بۆ جۆرێک لە ڕمووزن دەگۆڕێت. «گەورەم بیهێنە پێشچاوی خۆت، بەیانییەک لەخەو



هەستین و هەموو تورکیمان بیرچوو‌بێتەوە، خوانەخواستە شتێکی وەها رووبدات چ کارەساتێکی گەورە دەبێت بۆ ئوممەتی ئێمە، چ کارەساتێک دەبیت بۆ بەشەریەت زمانێکی وا جوان لەناو بچێت.»[٩] مستەفا کەمال بە هاوکاری کوردەکان و بەڵێنە بریقەدارەکانی پایە و بناغەی خەلافەتی هێنایە خوارەوە و دواتر وەک دوژمنێکی سەرسەخت پشتی لێکردن و بە هەموو شێوازێک بەرەنگاریان بوویەوە. سەرەتا کەوتە گرتن و لە کونجی زیندان ئاخنینی کەسە دیار و ڕۆشنبیرەکان، دواتر بەرپەرچی هەموو ئەو دەنگە ناڕازی و شۆڕشگێڕانەی دایەوە کە داوای مافی بەکارهێنانی زمان و سەربەخۆیان دەکرد.

نەورەسێک بەسەر چیاکانی کوردستانەوە لە شەقەی باڵ دەدات، بەسەر دوند و پێدەشت و دۆڵەکاندا دەفڕێت، لە بناری گردێک دێتەخوارەوە و تینوێتی بە ئاوی سازگاری کوردستان دەشکێنێت، دیسانەوە باڵەکانی لێک دەدات و بەسەر شاری مێردین و نوسێبیندا دەفڕێت و دێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی لە گوندی (ژڤینگی). ئەو نەورەسە مووسا عەنتەرە. پاش ئەو هەموو دادگایی و زیندانیکردنە لێ نەگەڕان نەورەسەکەی ئێمە بەکامی دڵ بەسەر چیا و دۆڵ گوند و کوێستانەکانی نیشتماندا بفڕێت و بەرگەکانی تری بیرەوەرییەکانی بنووسێتەوە، ڕۆژی ١٩٩٢/٩/٢٠ دڵە ژیاندۆست و مرۆڤدۆست و کوردپەروەرەکەی لە لێدان دەوەستێنن و بەو کارە چەپەڵەش مووسا عەنتەر لە دڵی هەر تاکێکی کورددا وەک مۆمێک بۆ هەمیشە دادەگیرسێنن.



**سەرچاوەکان:**


١ – بیرەوەرییەکانم، مووسا عەنتەر، وەرگێڕانی لە تورکییەوە: محەمەد عزەدین، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای فام، چاپی دووەم، هەولێر٢٠٢٢. ل٤٢

٢ – هەمان سەرچاوەی سەرەوە،ل١٩٣

٣ – هەمان سەرچاوەی سەرەوە، ل٣٥،٣٤.

٤ – برینا ڕەش، شانۆگەری، مووسا عەنتەر، لە کورمانجییەوە: محەمەد عزەدین، چاپی یەکەم، دەزگای فام، ٢٠٢٣، ل٩٦.

٥ – هەمان سەرچاوەی سەرەوە، ل٩٨.

٦ – هەمان سەرچاوەی سەرەوە، ل١١٥.

٧ – ئەنتیگۆنە، سۆفۆکلیس، و. خەبات عارف، چاپخانە ڕۆژهەلات، ٢٠١٧ ل٧١.

٨ – هەمان سەرچاوەی سەرەوە، ل٥٨.

٩ –داگیرکردنی تاریکی، ڕۆمان، بەختیار عەلی، چاپی دووەم ٢٠٢١، ناوەندی ڕەهەند. ل٢١.

چەندە جوان و مەزنییە بۆ مرۆڤ کە بە هەڵوێستی مرۆڤدۆستی و ژیاندۆستی و ئاشتیخوازی، بێ سڵکردنەوە لە هیچ ئازار و ئەشکەنجەیەک دژی زوڵم و جەور و ستەم بجەنگێت و بێ پسانەوە لە خەبات و بەرخۆداندا بێت. ئیدی ئەوەیە وا لەو کەسە دەکات، ببێتە نەمر و تا هەتایە لەنێو گەلی خۆی و تێکرای مرۆڤدۆستانی دنیادا بە نەمری بمێنێتەوە.

نموونەی مرۆڤی ئاشتیخواز و ئازادیخواز و مرۆڤدۆست و ژیاندۆست لە دنیادا زۆرن، بۆ نموونە "گاندی هیندی و ماندێلای خوارووی ئەفریقا" کە بێ کۆڵدان خەباتیان بۆ گەلی خۆیان و ئازادبوونی کۆمەڵگەی خۆیان دژی چەوساندنەوە و بێدادی کردووە، دەی خۆ مووسا عەنتەرەکەی کوردانی خۆیشمان، لە نموونەی ئەو پیاوە نەمرانە بووە! بەڵام بە یەک جیاوازییەوە، ئەوان ئازادی و سەربەخۆیی گەلانی خۆیان بینی، کەچی مەخابن مووسا عەنتەرەکەی ئێمە بەو خەمەوە سەری نائومێدانەی نایەوە و بە دەستی ناحەزان و نەیارەکانی لە تەمەنی "٧٢"ساڵیدا شەهید کرا.

مووسا عەنتەر لە ساڵی ١٩٢٠، لە ماڵباتێکی کوردیی باکووری کوردستان دێتە ژیانەوە، لە ساڵی ١٩٩٢ تیرۆر دەکرێت و شەهید دەبێت!

ساڵی ١٩٢٣ کاتێک دەوڵەت و حکومەتی ئەتاتورک دادەمەزرێت، ئیدی بە بەرنامە و بەوپەڕی دڵڕەقی و بە ئاگر و ئاسن هەرچی بەرخۆدانی کوردانە لە ساڵەکانی (١٩٢٥- ١٩٢٨- ١٩٣٠- ١٩٣٦- ١٩٣٨- ١٩٤١- ١٩٤٢) سەرکوت کرابوون.

مووسا عەنتەر کە هێدی هێدی چاو و گوێ دەکاتەوە و هەست بەو زوڵمە زۆرە دەکات بەرانبەر گەلەکەی دەکرێت، تەنانەت ئاخاوتن بە زمانی کوردییش قەدەغە بووە! ئیدی دروشمی (زمانمان ناسنامەمانە، بێ زمان ناسنامەمان ون دەبێت) بۆ خۆی دادەنێت و بەوپەڕی ئازایەتییەوە دەکەوێتە خەبات و تێکۆشان، هەم بە ئاخاوتن و هەم بە نووسین بە زمانی کوردی. لە یەکێک لە دادگاییکردنەکانیدا لە دادگایەکی دیاربەکر کە خۆی لە لاپەڕە (٣٦٧)ی بیرەوەرییەکانیدا باسی دەکات، داواکاری گشتی ڕووی تێدەکات و نامەی تۆمەتەکانی بۆ دەخوێنێتەوە، ئاوا باسی زمانی کوردی کرابوو: "کورد بە نۆ هەزار وشە قسە دەکەن، لەو ژمارەیە نزیکەی سێ هەزار و شتێکی عەرەبییە، هەزار و شتێکی فارسییە، نزیکەی هەزار وشەشی تورکییە، یانی ئەوەی دەمێنێتەوە تەنیا سیوپێنج وشەی کوردییە، بەڵام کورد سەرجەم ئەو وشانەی قسەی پێدەکەن، وا دەزانن کوردییە و بە کوردیی دەزانن!" کە دێتە سەر مووسا عەنتەر بەم شێوەیە وەڵام دەداتەوە: "جەنابی دادوەرانی بەڕێز، نازانم لە ماڵەکانتاندا کولانەی مریشکتان هەیە یان نا؟ ئەگەر کولانەی مریشکتان لە ماڵەوە هەبێت، داوا دەکەم بەیانی بەر لەوەی بێنە ئێرە، پێنووس و کاغەزێک بە دەستانەوە بگرن و بڕۆنە بەردەم کولانەی مریشکان و سەرنج لەو دەنگانە بدەن قا قا، قو قو، جک جک هتد...، کە مریشکەکان دەریدەبڕن، ئەوجا دەبینن و گوێتان لە چەند دەنگی جیاواز دەبێت، ئینجا هەست دەکەن بە لای کەمەوە پەنجا وشە دەنووسنەوە، کە لە زاری مریشکەکانەوە دەردەچێ، دوای ئەوەی وشەکانتان نووسییەوە ئەو پرسیارەتان بە مێشکدا دێت، ئایا ئەو کوردە بەقەدەر مریشکیش وشەی نییە و لەوانیشی کەمتر هەیە؟ تەنیا سیوپێنج قاقا و قوقو ماوەتەوە."

مووسا عەنتەر بە هیچ شێوەیەک سڵی لە زیندان و دادگاییکردن و دادوەران نەکردووەتەوە، خۆی

دەرچووی کۆلێژی یاسا بووە، شارەزایی تەواوی لە یاساکان و دادوەرییکردندا هەبووە، زۆربەی جاریش لە وەڵامی دادوەرەکاندا شێوەی شانۆگەری نمایش کردووە، کۆمیدیانە زۆربەیانی بە تەوس و قسەی نەستەق هەم خستوونیەتیە پێکەنین و هەم تووڕەی کردوون!

عەنتەر زۆر بایەخی بە خوێندن و خوێندەواری داوە، بۆیە هەمیشە خەڵکی هان داوە لە نەزانی و نەخوێندەواری و جەهالەت قوتار ببن و هۆش کراوە و بەئاوەز بن، هەر بۆیە لە زیندانی حەربیەی سەربازی لە ئەستەمبووڵ لە ساڵی ١٩٥٩ کە بارودۆخی زۆر خراپ دەبێت، لەبەر نالەباری شوێنەکەیان و خراپ مامەڵەکردنیان دەست بە مانگرتن دەکەن بۆ باشترکردنی خواردن و بایەخپێدانیان لە پاکوتەمیزی شوێنەکەیان و بوارپێدانی خۆشۆردن، بۆیە لەسەر ئەوە سزای دەدەن و ئەو بە دەمراستی ئەوانی دیکە دادەنێن. خۆی لە لاپەڕە (٢٥٨)ی بیرەوەرییەکاندا دەڵێت: "من لە شوێنە نوێیەکەم کاتێک بۆ ڕۆژی دواتر بەرەبەیان داهات، تەشتیان بۆ هێنام تا لەناو زێرابی پیسایی گوو، نان بخۆم، بەڵام ڕەتم کردەوە، ئیدی ژەمەخواردنەکانی دیکەشم نەدەخوارد، بەمشێوەیە سێزدە ڕۆژ لەسەر ئەو تەختەیە هیچ زادێکم لەسەر زارم نەنا، گەنجێکی ئەرمەنی خواردنی بۆ ئامادە دەکردم، ناوی کیر کۆر بوو، ئەو هەموو بەیانییەک بە هەنجەتی ئاوهێنان، قۆرییەک چای پڕ شەکری بۆ دەهێنام و دەمخواردەوە."

گەلۆ لەو زیندانەدا و بەوپەڕی خۆڕاگری و بە باوەڕی پۆڵایینی بە مەسەلەی ڕەوای گەلەکەی، مووسا شانۆنامەی (برینا ڕەش) دەنووسێت، کە تێیدا منداڵانی هەژاری کورد هان دەدات بخوێنن، هەتا لەنێو خۆیاندا دکتۆر هەبێت چارەسەری دەرد و نەخۆشی و ئازارەکانیان بکات.

مووسا عەنتەر هەمیشە خۆی گوتەنی لە زیندانێکەوە بۆ زیندانێکی دیکە، بەریان داوە و دواتر گرتوویانەتەوە و دۆسیەی لە لای میت، کوردبوون و کوردایەتی بووە. هەر بۆیە کاتێک کە دووری دەخەنەوە بۆ چەنەقەڵە ڕۆژێک بۆ ئامادەبوونی لە دادگای ئەستەمبووڵ کە دیارە مۆڵەتی پۆلیسی وەرگرتووە، ئەوجا ڕێگەی پێ دراوە بڕوات! وەک خۆی لە لاپەڕەی ٢٩٩ی بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت:

"کاتێ دانیشتنی دادگا دەستی پێ کرد، لەبەر ئەوەی ئەوەندە زۆر چووبوومە ئەو دادگایە، بۆیە لەگەڵ سەرۆکەکەی ببوومە نیمچەڕەفیقێک، ناسنامەکەمی بە کاتیبەکە نووسی و پێی گوتم: چ کارێک دەکەی؟ "کوردایەتی". بەو وەڵامەم داواکارە گشتییەکە سەر و میزاجی تێکچوو. سەرۆکی دادگا بە خەندەوە پرسیی: "ئەوە چ کارێکە؟" وەڵامم دایەوە: "لەسەر کوردایەتی تاوانبار کرام و دادگای تێهەڵچوونەوەش بڕیارەکەی پەسەند کرد، ئێستاش لەسەر کوردایەتی لە چەنەقەڵە لەژێر چاودێریی تەواودام. وا لای ئێوەیش لەسەر کوردایەتی دادگایی دەکرێم. بۆیە لە دۆخێکی ئاوادا گەر پیشەکەم کوردایەتی نەبێت، دەبێت چی بێ؟" دادوەر پێکەنی و بە کاتیبەکەی گوت: "کچم بنووسە پیشەی ئازاد". بە سەرێک قسەکەی دادوەر مانای ئەوە بوو کوردایەتی پیشەیەکی ئازادە."

لە هەر شوێنێک بیروڕای فاشیزم هەبێت، جا بە هەر فۆڕمێک بێت، ئەوا بەردەوام دژایەتیی خەڵکانی مرۆڤدۆست و ئازادیخواز بەوپەڕی دڕندانە و نامرۆڤانە دەکرێت، بۆیە هەرگیز نەیانهێشتووە ئەم پیاوە مەزنە بحەسێتەوە، بە دوایەوە بوون و پیلانی چەپەڵ و گڵاویان لە دژ کردووە. لە ساڵی ١٩٧٨ لە کاتێکدا بە ڕێکەوت لە ماڵەوە و لە گوندەکەی خۆیان نابێت، پیلانی کوشتنی بۆ دادەنێن و ماڵەکەی دەسووتێنن، ئاگایان لەوە نابێت کە لە ماڵەوە نییە، کاتێ پێدەزانن لە ماڵ نییە، فەرمانی گرتنی بۆ دەردەکەن، ئەویش



که پێدەزانێ و بۆ خۆی شارەزای کردەوەکانی جەندرمەیە، بۆیە هەر بۆ خۆی دەچێت و خۆی ڕادەستی دادگا دەکات، ئەوجا بە چەند پۆلیسێکدا دەیبەن بۆ بەندیخانەی "نسێبین".

لەو بەندیخانەیەدا چاو بە دیوار و ئەرزدا دەگێڕێت، دەبینێت زۆر پیسوپلۆخن، بەلووعەی ئاو هەمووی شکاو، وا مەزەندە دەکات کە بۆ ماوەی سی (٣٠) ساڵە نۆژەن نەکرابنەوە، بۆیە وەک خۆی لە لاپەڕە (٥٤٩)ی بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت: "ڕۆژێک داواکاری گشتی هاتە بەندیخانەکە، منیش پێم گوت: "جەنابی داواکاری گشتی، حکومەت بێ دەرامەتە و پارە نادات بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەم بەندیخانەیە، بۆیە ڕێگە بدەن من لەسەر ئەرکی خۆم دەمەوێ ئێرە نۆژەن بکەمەوە". داواکارە گشتییەکە گوتی: "جا لەبەر چی ئەو کارە دەکەی؟ یان ئەوەش پروپاگەندەیەکە بۆ خۆت؟" وەڵامم دایەوە: "شتی وا لەگۆڕێ نییە، جەنابی داواکاری گشتی، چونکە لەناو ئەو هەموو دەزگا فەرمییەی دەوڵەت، تەنیا زیندان بەر ئێمە دەکەوێت، بۆیە مادام زیندان بووەتە ماڵ و موڵکی ئێمە، هەر هیچ نەبێ با خاوەندارێتیی بکەین."

درووود بۆ گیانی پاک و بێگەردی مووسا عەنتەر و هەموو ئەو کەسانەی لەپێناوی مرۆڤدۆستی و ژیاندۆستی شەهید کران و لەنێو گۆڕدا خەم و ئازاری میللەت و ڕەنجدەرانیان لە کۆڵ داگرت!

سڵاو لەوانەیش کە تا ئێستا بە بیروباوەڕە پتەو و درەوشاوەکەی مووسا عەنتەرەوە، ڕێگەی خەبات و تێکۆشان بەر نادەن و سەنگەر چۆڵ ناکەن. ڕێبازی ئەو پیاوە گەورەیە ئەوەندە ڕەوا و درەوشاوەیە کە لە ئێستادا سەدان و هەزاران لە پەیڕەوییکەرانی لە زیندانەکانی تورکیادا ئاڵای ئازادی و خۆبەدەستەوەنەدان هەڵدەکەن و گیان بەخت دەکەن.

٢٢/ ٥/ ٢٠٢٣



# مووسای بێ عەسا

محەمەد عزەدین

مووسا عەنتەر، رۆژنامەڤان و سیاسەتمەدار و پارێزەر و نووسەر (1992-1920) کەسێکی دیاری باکووری کوردستان و تورکیای، سەد ساڵی ڕابردووە. بێ هیچ گومانێک ئاپێ مووسا، بە یەکێک لە گرنگترین کەسایەتییەکانی سەدەی ڕابردووی کورد دادەنرێت لە باکووری کوردستان.

ئەو بە هەڵوێست و کار و کردەوە و نووسینەکانی، بۆ پارێزگاریکردن لە گەلی کورد و زمانەکەی، بەرانبەر بە حکومەتە جیاوازەکانی تورکیا، زۆر تاڵ و تفتی چەشت؛ جگە لەوەی بەو هۆیەوە دەیان ساڵ کەوتووەتە زیندان؛ ئاپێ مووسا بێ عەسا نەبوو، بەڵکو ئەو بە پێنووسەکەی دەستی، وەک عەساکەی مووسا بەگژ نادادپەروەریدا دەچووەوە، تا ئەو کاتەی سەری خۆی لە ڕێگە دانا.

مووسا عەنتەر لە پەرتووکی (بیرەوەریەکانم) دا دەنووسێ "گەر سەرنج بدەن، لەگەڵ عەبدولڕەحمان قاسملوو، لەسەر هەمان ڕێچکەداین، بەڵام تاکە جیاوازیمان ئەوەیە، ئەو لە من بە بەختتر بوو؛ چونکە ئەو مردنەکەشی شەرەفمەندانە بوو. بۆیە گەر منیش شانسم هەبێت و لە ڕێی خەڵکەکەم شەهید ببم، بۆ من زۆر گەورەییە. عەبدولڕەحمان ئەوڕۆ لەناو خەڵک وەک ئاڵایەکی سەرکەش دەشەکێتەوە، ئەی گەورەترین شەرەفیش هەر ئەوە نییە؟". ئاپێ مووسا بۆیە ئاوا دەڵێ، چونکە خۆی عەبدولڕەحمان قاسملووی ناردبووە فەڕەنسا بۆ خوێندن.

جا من نازانم بڵێم دڵخۆشم بەوەی ئاپێ مووسا ماوەیەک دواتر شەهید دەبێ و ئاواتەکەی دێتە دی، یانیش خەفەتبارم بەو تاوانە ترسنۆکانەی بەرانبەر بە جوامێرێکمان کرا؟ چونکە تا ئێستاش قسە لەسەر ئەوە دەکرێ کێ و کێ مووسا عەنتەریان چۆن و بۆچی شەهید کرد؟ بەڵام هیچ گومانی تێدا نییە، گرووپێک گەر ددان بە بوونیشی نەنرێت، بە ناوی ژیتەم، پیلانی کوشتنی ئەویان داڕشت.

### چۆنیەتیی شەهیدکردنی مووسا عەنتەر

ئێوارەیەکی درەنگی بیستەمین ڕۆژی مانگی نۆی ساڵی 1992 لە دیاربەکر، مووسا عەنتەر، لە یەکێک لە میوانخانەکانی ئەو شارە؛ چاوەڕوانە تا بچێ مەسرەتی لەنێوان دوو لایەن بکات. ئەو کەسەی چاوەڕێی دەکا، بە تاکسییەک هەڵیدەگرێ و دەیانبات بۆ ئەو ماڵەی بڕیار بوو ئاشتەواییەکەی لێ بکرێ. شۆفێرەکە سەرەتا ڕێگە دەگۆڕێ، بەڵام دووبارە دەگەڕێتەوە ناوچەی سەیران تەپە. لە کۆڵانێک دێنە خوار و بەپێ دەکەونە ڕێ، بۆ دۆزینەوەی ناونیشانەکە. ئەو کەسەی دەیانباتە مەسرەتییەکە، ماڵی ئەو کەسە لە دوکاندارێکی ئەوێ دەپرسێ، بەڵام پێی دەڵێن "هیچ کەسێک بەو ناوە ماڵی لێرە نییە". بکوژ بە بیستنی ئەم هەواڵە شپرزە دەبێ، چونکە دوای ئەو بەرسڤە، مووسا عەنتەر کە لەبەر تەمەن زۆری بە هێواشی لە دواوەی دەڕوا و پێی دەڵێ "تۆ خۆشت نازانی دەچیتە کوێ". لەو کاتەدا لە کوچەیەکی تاریک، حەمیدی بکوژ ڕووی دەسووڕێنێ و بە چەندان فیشەکێک مووسا عەنتەر شەهید دەکات. شەهیدکردنی ئاپێ مووسا لە دڵی یاشار کەمال دەبێتە کەسەرێک و ناتوانێ باوەڕی پێبکات، بۆیە لەو بارەیەوە دەڵێ "هیچ کوردێکی هێمن و لەسەرخۆی وەک مووسا عەنتەرم نەبینی. بۆیە ناتوانم لە دەوڵەتی بکوژەکەی خۆشبم". یاشار کەمال ناحەق نییە، چونکە، کاتێک بەشێک لە هێزەکانی ئاسایشی تورکیا دەچنە سەر تەرمەکەی، لەنێوان خۆیان دەڵێن "باشترین کورد، کوردێکی مردووە".

ساڵی 2021 ڕێک 29 ساڵ بەسەر ئەو تاوانە تێدەپەڕێت، کە بەرانبەر بە کەڵەنووسەرێکی کورد کرا، وەلێ تا ئێستا بکەرانی نەدراونەتە دادگا و دۆسیەکەی هێشتاش هەر بە کراوەیی و بەبێ ئەنجام لە دادگاکانی تورکیا ماوەتەوە. بەڵام داخی گران ئەوەیە، گەر لە ماوەی ساڵێکدا دۆسیەکە یەکلایی نەکرێتەوە، بەهۆی تەواوبوونی کاتی یاسایی، بۆ هەتا هەتایە دۆسیەکەی دادەخرێت و دەخرێتە نێو ڕیزی ڕەفە تاریکەکان؛ لەپاڵ سەدان فایلی دیکەی بکوژانی بکەر نادیار لە تورکیا.

مووسا عەنتەر، بە درێژایی کاروانی ژیانی، لەگەڵ چەندان کەسایەتی وەکو شێخ سەعیدی کوردی و ئیسماعیل بێشکچی و عەبدولڕەحمان قاسملوو و کامەران بەدرخان و جگەرخوێن و یاشار کەمال و عەزیز نەسین و دایکی عەبدوڵڵا ئۆجەلان و مەدام میتران و یڵماز گونایی و نووری سەعید پاشا و یاشار کایا، لەسەر چەندان مژاری جیاوازی کوردستان و تورکیا بیرەوەریی تایبەتی هەبووە؛ بەڵام زۆربەی سەرگوزەشتەی ژیانی لەگەڵ ئەو کەسایەتییانە هەر لە سەرەتاکانی دامەزراندنی کۆماری تورکیا تا شەهیدکردنی، هەر سەبارەت بە کورد و کوردستان بووە. بۆیە وتە ناودارەکەشی هەر سەبارەت بە کوردستانە کە دەڵێ "گەر زمانەکەم مەترسی بێت، بۆ سەر پایەکانی دەوڵەتەکەت؛ کەواتە وڵاتەکەت لەسەر خاکەکەی من بنیادناوە".





# پرسی کولتوور و شۆفێنیی تورك له بیرەوەرییەکانی مووسا عەنتەردا

وەهاب حەسیب محەمەد

**دەستپێك**

سەرباری چەوسانەوەی کورد لە مەودایەکی دووورودرێژدا، بەڵام میللەتەکە توانیویەتی پارێزگاری لە ناسنامە و کولتووری خۆی بکات، زمان کۆڵەکەیەکی سەرەکیی ئەو کولتوورە بووە، هاوکات هەڵگری بیروبۆچوون و گشت ژانرێکی ئەدەبی و فەرهەنگی نەتەوەکە بووە، لەم پێناوەشدا کەسانێک چاکیان کردووە بەلادا و ژیانیان بۆ ئەو بوارە تەرخان کردووە، لە باکوور مووسا عەنتەر کەسێکی دیار و ناوێکی درەوشاوەی ئەو مەیدانەیە، دواتر ژیانی لەو پێناوەدا دانا، بیرەوەرییەکانیشی باشترین گەواهیدەرن، ئەم چەند دێرە بە کورتی و پوختی ئەو ڕاستییە دەخاتە بەرچاو.

**زێد و لەدایکبوون**

ئاپێ لە ساڵی 1920 لە گوندی "زیڤێنگێ" هاتووەتە دنیا، لە یادەوەرییەکانیدا دەنووسێت "زیڤێنگێ" واتە کوێستان، کوێستانێک نەک بۆ خلیسکانی سەربەفر و گەپ و خۆشی، بەڵکو بۆ ئەوە بوو زستان حەیوانی تیادا ڕاگیر بکەین، بەڵام داگیرکەر دوای شەشتوپێنج ساڵی تەمەنم ناوی ناوچەکەیان گۆڕی کردیانە "ئەشکەوتە کۆن" لە کاتێکدا تەمەنی حەوت هەزارساڵە، لەمەڕ دنیای منداڵی چەند بیرەوەرییەک دەگێڕێتەوە لەوانە بێریان، بووکگواستنەوە و خەتەنەکردن بە بۆچوونی ئاپێ لە ڕۆهەڵاتی ناڤین هەزاران ساڵ بەر لە ئیسلام خەتەنەکردن هەبووە، هەروەها شێخەکانی سیرتی بۆ خەتەنەکردنی منداڵان تا ئیستانبوڵ و میسر ڕۆیشتوون، هاوکات باسی ئەو دەرمانانەش دەکات کە شێخەکان لە برینەکەیان داوە و چۆن دوای ماوەیەکی کەم ساڕێژ بوون و ئەو ڕازەشیان بە کەس نەگوتووە! ئاپێ دوای سی ساڵ دەچێتەوە سرێتی پرسیاری ئەو گژوگیایە لە نەوەکانی شێخ دەکات.

ماڵباتی مووسا ئاغابوونە و داهاتیان زیاد لە پێداویستی خۆیان بووە، ئەو کارە پاسابووە هەمیشە دەنگبێژەکان لەکن ماڵباتی وی بمێننەوە و سرووودی ئایینی و قەسیدەی شاعیرانی کلاسیک بچڕن، هاوکات گشت ئەو زوڵم و ستەمانەی بەسەر میللەتەکەیاندا هێنراوە لە سروود و ئاوازەکانیاندا ڕەنگریژبوون، دواتر بوون بە هەوێنی سەلیقەی زمانەوانی و بایەخدانی ئاپێ بە زمان.

لەمەڕ کێشەی زمان دەڵێ: سەردەم گۆڕا و خەڵک وەک پێشوو نەدەمان، هەموو دنیا بوونە حکومەت و کوردییش ڕابوون، کۆماری تورکیا خۆی ڕێکخست جەندرمە و فەرمانبەرانی میری بە مەبەستی ئەستاندنی باج و سەرانە دەچوونە دێهاتەکان، بەڵام لە تەواوی ناوچەکەدا کەسێکت نەدەدۆزییەوە تورکی بزانێت، لە بەرانبەردا جەندرمەش تێروپڕیان لێ دەدان، بە خاتری ئەوەی لە زمانی جەندرمە تێ بگەم دایکم منی ناردە بەرخوێندن، بابیشم پیاوێکی نەخۆش و کەنەفتی سەر جێگە بوو، کەسیش نەبوو جێگەی بگرێتەوە، دایکم کاری موختاری گوندەکەمانی لەئەستۆ گرت بۆ ئەو سەردەمە کارێکی نامۆبوو، ئەو دەنووسێت ئەگەر لێکۆڵینەوەیەک بکرێت ڕەنگە دایکم یەکەمین ئافرەتی موختاری فەرمی بێت لە تورکیادا.

وەختایەک بە جەندرمە دەگوترا ڕۆمی، سەردەمێک دوای ئەو ڕووداوە زانستم ئەحمەدی خانی لە پێشەکیی مەم و زیندا دەڵێ: ڕۆم و عەرەب و عەجەم، واتە تورک، عارەب و فارس، ئاخر سەرەتا ڕۆم و بیزانسێکان کوردستانیان داگیر کردووە، مامەڵەی خراپی ئەوان ئەو ناوەی بەسەردا سەپاندوون، ئێستاش بەرانبەر مامەڵەی خراپی سەربازانی تورک کورد دەڵێت: ڕۆمی ویژدانی نییە.

ساڵی 1927 بە مەبەستی فێربوونی زمانی تورکی وەک گوێگر لە قوتابخانەی "کەرجۆوس" دەوام دەکات و دواتر چەند



وشەیەکی تورکی فێر دەبێت. هەموو مەبەستی لەو کارە ئەوەبووە هاوین جەندرمە هاتنە گوندی نەیان کوتن، چونکە بۆ ئەوان گرنگ نەبوو چیان دەوێت، ئاریشەکە لێک نەگەیشتبوو لە نێوان هەردوولادا.

لە مێردین لە ماوەی پێنج ساڵی خوێندنیدا زۆر بوویەر لە ژیانی مووسادا ڕوو دەدەات، بە نموونە ساڵی 1932 لەشکری تورک لەناو عەشیرەتی "ئۆمەریان" ئۆپەراسیۆنێک بە ناوی "خاوێنکردنەوە" پیادە دەکات و گەنجان لە ترسان هەڵدێن و ڕوو لە چیای تیخوب دەکەن، هاوکات چەند کەسێکی عەشیرەت بەرەنگاری سوپا دەبنەوە و کەسانێک دەکوژرێن و بریندار دەکرێن، سەربازەکان سەری بریندارەکان دەبڕن و لەو ناوەدا فڕێیان دەدەن و دواتر سەرەکانیان لە گوێتی ناوە و بە مەبەستی ترساندن پیشانی خەڵکی ناوچەکەیان داوە!

لەو سەروبەندەدا حکومەت بە مەبەستی ئاسمیلەکردنی سەرۆکعەشیرەت و عەشیرەتەکان چەند قوتابخانەیەکی لە ناوچەکەدا کردووەتەوە، ئەوکات تەنها کوڕوکاڵی خانەدانەکانی وەردەگرت، قوتابخانەکە نەوەد خوێندکار لەخۆ دەگرێت، کاتێک پیلانی حکومەت سەر ناگرێت ناچار ساڵی 1935 قوتابخانەکە دادەخرێت. دواتر بەشێک لەو خوێندکارانە لەگەڵ کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان دەکوژرێن و بەشێکیان بۆ حەلەب کۆچ دەکەن، پاشان بۆ خوێندن ڕوو لە مێردین دەکات، ئەوکات لە شارەکەدا پێنج قوتابخانە هەبوون، بەڵام لەناو شار قسەکردن بە کوردی یاساخ بووە، حکومەت هەر کەسێکی گرتبا بە کوردی دەئاخڤێت لە بەرانبەر بەکارهێنانی هەر وشەیەک لیرەیەک سزای بەسەردا دەسەپاند، بۆیە مێردین ببووە کەمپی کەڕوڵان، ناچار خەڵک لە نێوان خۆیاندا بە هێمای دەست پەیوەندییان دروست دەکرد.

**ژینناوایی دایبابی**

یەکێک لە ناخۆشیەکانی سەرەتای خوێندنی ژینئاوایی باوکێتی، وەختایەک لە یەکەم پشووی قوتابخانە دەگەڕێتەوە بابی نابینێت، دواتر پوورێکی بە گریانەوە مردنی باوکی دەدات بە گوێچکەیدا، باوکی لە تەمەنێکی گەنجی و بە خوێن مەینی مێشک تووشی ئیفلیجی دەبێت، دایکی حەفت ساڵان وەک منداڵ بەخێوی دەکات، لە پەسنی دایکیدا دبێژێت: دایکم لە عەشیرەتی "بینیاتکی" ئێزیدیە باپیری دایکم سەرۆکی عەشیرەتەکەیان بووە و دواتر موسڵمان بووە، هێندە زاڵم بووە پێیان گوتووە خوای چۆلی، سێبەری دایکی هەمیشە بە سەریەوە بووە، کاتێک پرسیاری لێ دەکەن ئەو خەباتە ئەدەبی و سیاسیەت لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ دەڵێت: دایکم. دەڵێت: ئەگەرچی دایکم نەخوێندەوار بوو هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم و دەیگوت کوڕم هیچ کات باوەڕ بە قسەی عارەب و تورکان مەکە، بەردەوامیش بە گوێیدا دەچرپاندم هەرگیز پیاوەتی و ئازایەتی خۆت لە بیرمەکە.

**خوێندن لە ئەدەنە و ئیستانبوڵ**

کاتێک لە ئەدەنە خوێندکار دەبێت دوو ڕووداو کاریگەریی لەسەر دادەنێت، یەکێکیان شۆڕشی دێرسیم و ئەویتریان چارەنووسی ولایەتی ئەسکەندروونە، لەمەڕ شۆڕشی دێرسیم دەڵێت: سەید ڕەزا سەرکردایەتی شۆڕشی دەکرد و "بەسێ"ی هاوژینی ڕێبەرایەتی گرووپێکی گەریلا، وەک لاوێکی خوێنگەرم بەردەوام وەڵامی ئەو ڕۆژنامە دەداتەوە کە لە هەوڵی زڕاندنی ناو و ناوبانگی شۆڕشەکەدا دەبن، هاوکات وەک تەشقەڵە خوێندکاران بە کوڕی

ەسێ بانگی دەکەن و جنێوی پێ دەدەن، ئەویش لە
ەڵامدا جنێو بە زبێدەی دایکی مستەفا کەمال دەدات،
، بەرانبەر ئەو پەرچەکردارەدا پێنج ڕۆژ دەست
ەسەر دەکرێت، ئەوەش یەکەم دەستگیرکردنی بووە
، ژیانیدا.
ساڵی 1941 ڕوو دەکاتە ئیستانبوڵ لە چاو شارەکانی
ردا شارەکە تەواو جیاواز بووە. لە هەمان ساڵدا لەگەڵ
ەند هەڤاڵێکیدا ڕۆژنامەی "دیجلە کاینای" دەردەکات،
ۆخۆی لە یادەوەرییەکانیدا ئاماژەی پێ داوە کە بۆ
ەکەمجار لەو بڵاڤۆکەدا نهێنیی کۆمەڵکوژی زیلان،
ۆرشی شێخ سەعید، جووڵانەوەی ئاگری و دێرسیمم
ڵاوکردووەتەوە سەرباری ژمارە زۆروزەوەندەکانی
اگوێزراوانی کورد لە وڵاتەدا. ئاپێ لەو بەشەی
ەوەرییەکانیدا هۆکاری نووسینی شیعری "سیوسێ
یشەک"ی ئەحمەد عارفی شاعیر بۆ بڵاوکردنەوەی
ۆژنامەکەیان دەگەڕێنیتەوە، بە بۆچوونی ئەو
یعرەکە ئەوانی گەورە کرد.
ساڵی 1944 هاوسەرگیری دەکات و بەرهەمی
ارەکەیان دوو کوڕ و کیژێکە. لەو سەروبەندەدا
ێکخراوێک بە ناوی "کۆمەڵەی ڕزگارکردنی کوردان"
ەتەک هەڤاڵەکانیدا دادەمەزرێنێت، دواتر سوێند بە
ڵای کوردستان و چەک دەخۆن کە هەرگیز خیانەت و
ۆفاری لە میللەتەکە نەکەن، چەکەکەش دەمانچەیەکی
اورپییەکیان دەبێت و لەپای بەردەوامی ئەو سوێندەدا
ساڵی 1948 هەفتەنامەیەک بە ناوی "سەرچاوەی
یجلە" بڵاو دەکاتەوە.
ووسا عەنتەر دەڵێت: یەکەم گرووپی فۆلکلۆری
وردی لە تورکیا ئێمە دامانمەزراند، بۆ ماوەی چەندین
اڵ شەوانمان بە مۆسیقا و پۆشاکی نەتەوەییەوە
ەنەخشاند و داوەتی ماڵباتی کوردانی ئیستانبوڵمان
ەکرد و ئەوانیش بە خۆشحاڵییەوە وەڵامیان
ەداینەوە. هەروەها لە کاتی جەنگی دووەمی جیهاندا
رووپەکەیان زۆر دەستکورت و پەڕپووت دەبن، ناچار
، کوردستانەوە ساوەر، نیسک و خواردنیان ڕادەست
دەکرێت. بەڵام هەندێک لایەن پۆلیس ئاگادار دەکەنەوە
کە مووسا عەنتەر پڵاوساوەر و پیاز دەرخوارد
خوێندکاران دەدات تا لە تەک خواردنی ئیستانبوڵ
ڕانەیەن، لە سەر ئەو کارە بانگهێشتی بنکەی پۆلیس
دەکرێت!
ساڵی 1951 ڕۆژنامەکە ڕادەگرێت، دواتر بە
هاوکاری "کەمال سولکەر" مانگانە بڵاوکراوەی
"شەرق" دەردەکەن. نووسینەکانی بڵاوکراوەکە زیاتر
کار لەسەر مافەکانی مرۆڤ دەکات تا کوردییش
بتوانیت لەو چوارچێوەیەدا مافەکانی دەستەبەر بکات.
لەم ساڵەدا ئاپێ زۆر ماندوو دەبێت، بە قسەی خۆی
تەواوی چالاکییە کولتووری و میدیاییەکانی ڕاگرتووە
و گەڕاوەتەوە گوندەکەیان تا لەناو سروشتدا بژێت.
ساڵی 1956 لە ئیستانبوڵ دوکانێکی باڵوولە
"لەفە"فرۆشتن دەکاتەوە، لەمەڕ ئەم کارەی دەنووسێت:
بە درێژایی ژیانی سیاسیم لە هیچ لایەک پارەم
وەرنەگرتبوو، چیم کردبێ بە قازانجی کاری
خۆم کردوومە.
ساڵی 1958 وتارێک لەسەر کچێکی
دەرۆزەکەری کورد لە ڕۆژنامەی " ئیلەری
یورد" بە ناونیشانی "ژ بۆ خودێ سەدەقێ" بڵاو
دەکاتەوە، بە گوتەی ئاپێ گوتارەکە وەک بۆمبا
دەنگی دایەوە، داواکاری گشتی دیاربەکر
دۆسیەیەکی لەسەر دەکاتەوە بە تاوانی
چۆن دەبێت بە کوردی بنووسرێت! لەپای
بێدەنگی ئەمجارە مووسا دیمانەیەکی خەیاڵی
لەتەک پیرەمێردێکی کوێردا دروست دەکات،
جارێکی تریش دۆسیەیەکی بۆ دەکرێتەوە،
بە شێوەیەک هەموو نووسینێکی دەبێت بە
دۆسیەیەک، هاوکات داواکارییەکانی ئاپێ
لە ئەستانە، ئەنقەرە و کوردستاندا دەنگ
دەداتەوە.
ساڵی 1958 حکومەت بە ئالیکاری
هەندێک لە ئاغاکان و نیمچەشێخەکانی



لایەنگری هەزاران تۆنی گەنمی ژەهراوی بە نرخی هەرزانتر لە جۆ بە هەژارونەداری کورد دەفرۆشن و دابەش دەکەن، ئەو گەنمە بە نەزانی لە لایەن خەڵکەوە دەکرا بەنان، پاشماوەیەکی کەم کاریگەریی لەسەر منداڵان دەردەکەوێت، **زارۆکان** دەموچاویان وەک مەیموون ڕەش **ئەدەگەڕێت** و جەستەیان مووی لێ دەڕوێت، **ئەخۆشییەکە لە**ناو مەردوومدا بە "برینا ڕەش" **شۆرەتی دەرکرد.**

**ئەوکات ڕۆژنامەی** "ئیلەری یۆرد" لە ئامەد کار **دەکات بۆ پیشاندانی** ئەو تاوانە و ڕیسواکردنی سەردانی زۆر جێگە دەکات، لە کۆتاییدا دەنووسێت ئەو وەحشیانە بۆ بنبڕکردنی میللەتی کورد سڵیان لە هیچ شتێک نەدەکردەوە، سەرئەنجام بەشێکی زۆری ئەو منداڵانە ژینئاواییان کرد لە کاتێکدا دەبوو ئەو گەنمە بۆ قەڵاچۆکردنی مار و مێروو بەکار بهێنرێت! بەو دواییانە گەنجە کوردەکانی سوریا "برینا ڕەش"یان کرد بە فیلم، مووسا بەو هەستانەوە نەتەوەییە زۆر کەیف خۆش دەبێ.

شەوی 17/ کانوونی یەکەمی/ 1959 دەستگیر دەکرێت و لە حوجرەیەکی تاریکی دەپەستن و ماوەی پێنج هەیڤ بوار نادرێت خۆی بشوات، لەپای ئەو کارەدا هەموو جەستەی دەبێت بە برین، هەتا 10/ ئاداری 1960 لەو شوێنە دەمێنێتەوە و ساڵی 1962 ئازاد دەکرێت. یەکەم وتاری لە مانگی مایسی ئەو ساڵەدا لە ژمارە دووهەمی گۆڤاری "بارش دوونیاسی" بە ناونیشانی هەستانەوەی ڕۆژهەلات و داواکەی دەنووسێت، هەروەها لەم بەشەی بیرەوەرییەکانیدا ئاپێ مووسا دەڵێت: ئەمریکا داوا لە تورکیا دەکات ڕادیۆیەکی کوردی لە کوردستان لەژێر چاودێریی تورکیا و ئەمریکادا بکاتەوە و تێچووەکەشی کە سیوسێ ملیۆن دۆلار بووە، ئەمریکا لە ئەستۆی دەگرێت، تورکیا داواکەی ڕەد دەکاتەوە، بەڵام شای ئێران داواکە قبووڵ دەکات و بەرهەمی ئەو بۆچوونە هاتنەئارای ڕادیۆی کرماشان بووە. دواتر ئەمریکا داوای لە تورکیا کرد فەرهەنگێکی کوردی تورکی - تورکی - کوردی لەسەر ئەستۆی ئەمریکا چاپ و بڵاو بکاتەوە، تورکیا ئەو داواکارییەیشی ڕەد کردەوە.

ساڵی 1964 کاتێک لە حەپسخانەی "سوڵتان ئەحمەد" بەند دەکرێت فایەق بوجاکی هاوڕێی دێرینی سەردانی دەکات، گرێی دڵی دەکاتەوە کە بە نیازە بە شێوەیەکی ناقانوونی پارتی دیموکراتیی کوردستان دابمەزرێنێت، بەڵام ئاپێ داواکەی ڕەد دەکاتەوە، پاشان شەنوکەوی بابەتگەلێک دەکات و دەنووسێت بێجگە لە پارتی کرێکارانی تورکیا بە ئاشکرا و نهێنی، ئەندامی هیچ پارتێکی دیکە نەبووە.

ساڵی 1965 بەشداری بانگەشەی هەڵبژاردن دەکات و دەبێتە بەربژێری حیزب لە شاری مێردین، سەرباری ئەوەی چوار هەزار دەنگی ڕەد دەکرێتەوە، بەڵام هێشتا خاوەنی دە هەزار دەنگ دەبێت، هاوکات هیچ پاڵێوراوێکی حیزب لە تورکیا هێندە دەنگیان نەهێنابوو، کەچی لە ناوەڕاستی بانگەشەی هەڵبژاردندا دادگای هێزی ئاسمانی ئەنقەرە تاوانباری دەکەن کە لە کاتی پشکنینی پێشمەرگەکانی بارزانی لەسەر سنووری عێراق، بە کوردی سڵاوی لە پێشمەرگە کردووە، تەنانەت فەرماندەی پێشمەرگەکان گوتوویەتی: لەژێر فەرمانی جەنابتداین؟! لەپای ئەو تاوانە لە بەندیخانەی چەلەقەنەی دەپەستن، هەروەها لەم بەشەدا ئاماژە دەکات کە تا ساڵی 1972 پەیوەندیی بە پارتی کرێکارانەوە هەبووە.

ساڵی 1980 کەتیبەیەکی کۆماندۆی سوپای تورکیا کە لە گوندەکەیان دەبن، شەو کاتژمێر سێ لەناو پێخەودا هەڵدەکوتنە سەری، پاشئەوەی بێڕێزی بەرانبەر دەکەن،

داوای لێ دەکەن تا ئەوان لێرەن لە ماڵ دەرنەچێت، دواتر بۆ چاوترسێنی خەڵکی ئاوایی کۆمەڵێک لاو دەستبەسەر دەکەن و هەندێکیان سەرەوخوار بە داردا هەڵدەواسن، دوای ئەوەی بڕێک چەکوچوڵ کۆ دەنەوە باروبارگەیان دەپێچنەوە و دەڕۆن.

ساڵی 1984 دوو گەشتیاری سویدی "ژنومێردێک" وەک گەشتیار دێنە ناوچەکەیان و داوا دەکەن ئاپێ ببینن، لە بێبەختی ئاپێ عەنتەر وشەی توریست بە تیرۆریست ڕاڤەی بۆ کرابوو، لەپای ئەو کارە سیازدە ڕۆژ لە بەندیخانەی تاکەکەسی دەپەستێون، دوای گوتووبێژێکی تووڵانی لەنێوان ئاپێ مووسا و بەرپرسانی حەپسخانە بڕیار دەدن بۆ ڕۆژی دواتر ئازادی بکەن، کاتێک دەگەڕێتەوە گوندەکەی دەست دەکات بە ژیانی شوانکارەیی، بەڵام هێندە تیرۆر، زوڵم و ستەمی دەوڵەت دەبینێت، ساڵی 1987 تۆبەکەی دەشکێنێت و دەست دەکاتەوە بە نووسین، پاشان لەبارەی نووسینەکانی دەڵێت: بۆچوونەکانم لە چوارچێوەی ئەوەیە کورد بە شێوەیەکی مرۆڤانە ژیانێکی ئاسایی بە سەر ببات، گشت تاوانێکی لەو بابەتەش مایەی شەرەف و گەورەییە.

ساڵی 1989 پارتی سۆسیالست لە ئامەد پانێلێک بە ناونیشانی "گۆڕانکارێکانی ئەورووپا بەرانبەر بە کورد" ڕێک دەخات و بانگهێشتی ئاپێ دەکات، مووسا قسەی خۆی دەکات، ڕۆژنامەنووسێک کاتێک ئەو حەشاماتە دەبینێت پێی دەڵێت: کاک مووسا دەڵێن ئەو خەڵکە بە خاتری تۆ هاتوون نەک پارتی کۆمۆنیست. بەڵام پۆلیس گشت وتەکانی تۆمار دەکات و دواتر لە دادگا وەک کێشەیەک لە قاڵبی دەدەن و بانگهێشتی دادگا دەکرێت. لە 1/ نیسان/ 1990 وەک دوایین دانیشتنی دادگا ئامادە دەبێت، کاتێکیش ئازاد دەکرێت هەموو بەندکراوەکان دەست دەکەن بە گریان و فیغان بۆ فیراقی ئاپێ، بۆخۆی لە دوابەشی بەرگی یەکەمی بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: لە حەفتا ساڵی تەمەنمدا دۆخی وەها تراژیدیام نەبینیوە.

ساڵی 1990 لەتەک ئیسماعیل بێشکچی ماوەیەکی باش لە ناوەندی میزۆپۆتامیا پێکەوە کاریان کردووە، بە بۆچوونی ئەو بەرهەمی ئەو کارکردنەوەی پەیمانگەی کوردی بووە لە ئیستەنبوڵ لە 18/ 4/ 1992، مخابن لە ئەیلوولی ساڵی 1992 لە یەکێک لە شەقامەکانی ئامەد ئاپێ غافڵکوژ دەکرێت و بە شێوەیەکی ساردوسڕ ئەسپەردەی خاک دەکرێت. چەندین کتێب و وتاری لەپاش بەجێماوە، بەنموونە "برینا ڕەش" و دوو بەرگی بیرەوەرییەکانی و وتارگەلێک، ناودارترینیان **"پێگەی** ئافرەت لە کۆمەڵگەی کوردی"**دایە لە نووسینەکەیدا** زۆر بە ڕاشکاوانە ئاماژە دەکات **لە مێژوودا جیاوازیی** ژن و پیاو لە کۆمەڵگەی **کوردەواریدا نەبووە،** لەو نووسینەدا باسی "پەریخان" **ناوێک دەکات کە** پێشەوایەتیی هۆزەکەی کردووە و... **هتد.**

ساڵی 1993 خەڵاتێکی ڕۆژنامەوانی بە ناوی مووسا عەنتەر دیاری دەکرێت و ئاپۆڕایەک لە نووسەر و ڕۆژنامەوانان تێیدا بەشدار دەبن.



**سەرچاوە:**

١/ بیرەوەرییەکانم، مووسا عەنتەر، وەرگێڕانی لە تورکییەوە: محەمەد عزەدین، چاپی دووەم، دەزگای فام، ٢٠٢٢ هەولێر.

٢/ ئینتەرنێت.

...هیچ یادەوەرییەکی شیرینم نییە تا بینووسمەوە.
ەواوی بیرەوەرییەکان، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، بە
ۆڵم و ئەشکەنجە و زیندانیکردن تێپەڕیوە، هەر دێڕێکی
ەو پەرتووکە کە دڵتەنگی و خەمباریی تاکەکەسین،
انیش باسکردنی چۆنیەتیی کۆمەڵکوژیی گەلەکەمە...)
جارێ بەر لە هەر شتێک دەبێت بڵێم: ئەو پیاوە سیاسیانەی خۆیان بە کورد دەزانن لە هەچ کوێیەک بن، ئەگەر ئەم کتێبەیان خوێندەوە "بیرەوەرییەکانی مووسا عەنتەر"، ئەگەر لە ماناکانی ئەخلاق و گەل تێگەیشتن، دەبێت شەرم بکەن کە زوڵم لە خەڵکی خۆیان دەکەن، چونکە ئەم کتێبە وانەیەکە بۆ بەدئەخلاقی ئەوانەی کە بوونەتە هۆکاری چەوساندنەوەی گەلەکەی خۆیان لە دەرەوەی دەسەڵاتی داگیرکەران... بیرەوەرییەکانی مووسا عەنتەر لێوانلێون لەو دێرانەی ناو ژیانی مرۆڤێک کە هەر خۆی لە ڕۆژگارێکی تاریک و پڕ لە ستەمدا ببووە پیاوی ناو ئازارەکان و بە نووسین، بە کردار شۆڕشی دژی نەیارەکانی گەلەکەی بەرپا کردبوو... بەهەق مووسا عەنتەر پیاوی بەرەنگاری و پارێزەری سەرسەختی گەلەکەی بوو لە باکووری کوردستان.

مووسا عەنتەر تا ئەو ڕۆژەی لە 20/9/1992 لە شاری (دیاربەکر) لە لایەن فاشتەکانەوە، لەپێناو گەلەکەیدا تیرۆر دەکرێت، زیاتر لە دە ساڵی تەمەنی لەناو زیندانە بەدناوەکانی تورکدا دەباتەسەر، بەمە مووسا ناوێکە بۆ هەڵدانەوەی ژیانی ئەو پیاوە مەزنانەی کە لە قووڵایی دەسەڵاتی ستەمکاری تورکدا بۆ یەک ساتیش لە تێکۆشان پشووی نەداوە و چیان پێکراوە بۆ بەرەنگاریی دەسەڵاتە قێزەونەکان کردوویانە و لەو پێناوەدا قوربانیان بە ڕۆحی خۆیان داوە.

مووسا عەنتەر لە ڕێگەی کتێبی (بیرەوەرییەکانم)ەوە دێت ژیانە پڕ لە ئازارەکەی خۆی و ئەو ستەمەی کە لە گەلەکەی کراوە وەکو کورد لەژێر دەسەڵاتی تورکدا، ورد دەخاتە ڕوو... ئەم کتێبە وەکو یادەوەری هەڵگری ئەو تێڕامانەیە زۆرکات مرۆڤ شەرم دەکات لەوەی کە زۆر کەس بە خۆیان دەڵێن سیاسی، یان ڕۆشنبیر، شەرمە بۆ ئەو کوردانەی کە جاران لە بەغدا و هەولێر و سلێمانیدا ببوونە چاوساغ و دژی ئیرادەی گەلەکەیان وەستابوونەوە بە خۆیان دەوت ڕۆشنبیر، یان سیاسی، شەرمە بۆ ئەو کوردانەی لە تاران و ئەستەمبووڵ و شامدا دەژین و دژی خواستی گەلەکەیان وەستاونەتەوە و بە خۆیان دەڵێن کورد، کەچی دەبینین مووسا عەنتەر لە ساڵی چلەکانەوە لە تەمەنی لاوی خۆیەوە وەکو کوردێک دێت لە کوردستانی باکووردا لە قووڵایی ئەستەمبووڵ و ئەنقەرەدا لەژێر ستەمی ئەو دەسەڵاتە شوومە فاشییەدا مەردانە بۆ پاراستنی مافی گەلەکەی و زمانی کورد و کولتوورەکەی دێتە مەیدان و سەرسەختانە دژی ئەو خووە نەگریسانەی تورک دەوەستێتەوە کە دەیانەوێت لە باکوور بنەبڕی ئیرادەی کورد بکەن، ئەوەی مووسا لە ژیانی خۆیدا شانی داوەتەبەر بۆ بەرگری لە گەلەکەی، هێز و توانایی ئینسانێکە مەگەر هەر لە ڕۆحی مووسادا خۆیدا بەو مەزنییەوە بوونی هەبێت.




ژیان و نووسینەکانی مووسا دەبنە هەڵگری ئیرادەی ئەو جوانخاسانەی، کە وەکو مووسا دەزانن مەرگ هەیە، بەڵام لەپێناو کوردبووندا مەرگ وەکو دیارییەکی مەزن بۆ خۆیان وەردەگرن و سڵ لە مەرگ ناکەوە. کاتێک مووسا عەنتەر و هاوڕێکانی لە 17/12/1959دا وەکو گرووپی 49کان دەگیرێن و لە بەدناوترین گرتووخانەکانی ئەو ڕۆژگارەدا لە ژووری تاکەکەسیدا زیندانی دەکرێن، دواتریش دوای بەربوونیان بە ئازاری ئەو گرتووخانە بەدناوەوە 24 کەسیان دەمرن، ئا لەو ڕۆژە ترسناکانەدا لاوێکی هاوڕێی مووسا عەنتەر بەدەم ئازارەوە بۆ وەڵامی ئەو ئازار و چەوساندناوەنەیان دێتە دەنگ و بە مووسا عەنتەر دەڵێت: مامۆ ئێمە نابەزین نەوەی ئەحمەدی خانیین.

هەر بەڕاستی کاتێک لاپەڕەکانی تەمەنی

مووسا عەنتەر لەم یادانەدا ئاوا بەو وشە ئازاراویانەوە هەڵدەدەینەوە، تێدەگەین کە کوردانی باکوور ئەوە زیاتر لە سەدساڵە کەوتوونەتە ژێر مەرگەساتی قڕکردنەوە، بەڵام هیچ سزایەک، هیچ مەرگێک، هیچ ئەشکەنجەیەک، هیچ هێزێک لەم نەتەوەپەرست و هێزە دڕندانەی تورک لەو ماوە دووردرێژانەدا ئیرادەی نەتەوەکەی مووسا عەنتەریان پێ نەشکێنراوە.

ئەم کتێبە وەکو یادەکانی بەتەنیا نابێتە هیی مووسا عەنتەر، بەڵکو هیی دەنگی هەموو ئەو نووسەر و کەسایەتییە مەردانەیە کە دەیان ساڵ لەژێر دەسەڵاتە چەوسێنەرەکانی تورکدا ژیانی خۆیان خستووەتە بەردەم مەرگەوە، ورد ورد دەمانباتە ناو ژیانی زۆر کەسەوە، بە ژیانی ئەو کوردە خۆفرۆشانەی ناو ئەو ڕۆژگارانەوە و بە ئازایەتیی ئەو تورکانەیشەوە کە بوونەتە پارێزەری کورد لە باکووردا... ئەوەی دێتە ناو ژیانی مووسا عەنتەرەوە بەرەنگارییە بەبێ هیچ سڵکردنەوەیەک، لە کوێ چەوساندنەوە هەبووبێت ئەو خۆی گەیاندووەتە ئەوێ، چ بە نووسین و چ بە ماڵ و کردار ئەم پیاوە مەزنە ژیانی بۆ گەلەکەی لە باکووری کوردستان تا ڕۆژی تیرۆرکردنەکەی تەرخان کردووە، هەروەک چۆن لە ساڵی پەنجاکاندا بەیەکەوە لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێیدا ڕۆژێک بۆ ڕزگاری و خیانەتنەکردن لە کورد پێکەوە سوێند بە ئاڵای کوردستان دەخۆن، ئەو ئاڵایەی کە خۆی دروستی دەکات. لەناو هەر بەشێکی ئەم کتێبەدا ئێمە بە زۆر دەرگای شاراوە دەگەین، ئەو دەرگایانەی کە تورک دەیەوێت لێوەی کورد قڕ بکات، بە سزادانی ئەوانەی بە کوردی دەدوێن، بە گەنمی ژەهراوی بۆ قڕکردنی کورد، بە هێزی دڕندەی سەربازی، بە کڕینی ئیرادەی مردووی زۆر کوردی خۆفرۆش... بەڵام بە ئیرادەی هاوڕێکانی مووسا تا ئێستا خەونی تورک خراپ پووچەڵ کراوەتەوە.

لەناو یادەکانی مووسادا ئێمە مووسا عەنتەر وەکو نووسەر نابینین بەتەنیا، بەڵکو پیاوێکە بە ڕۆحێکی دۆستایەتی و لێبووردەییەوە دەبێتە دۆستی بەشێکی زۆری سیاسییە تورک و ڕۆشنبیر و کەسایەتیی تورکیش، دێتە سەر ژیانی زۆر کەس، لەپێناو دۆستایەتی کورد و تورکدا دەبێتە دۆستی نازم حیکمەت و یەڵماز گونەی و دەیان کەسی تریش.

مووسا عەنتەر دەمانگەیەنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەوەی کوردەکانی لە باکووری کوردستان هێڵاوەتەوە لە ئاست هەموو چەوساندنەوەیەکدا بە درێژای دەیان ساڵ، ئیرادەی چەپەکانە، ئیرادەی ئەو ڕۆشنبیر و سیاسییە چەپانە بووە کە لەژێر ناوی سۆشیالیزمدا تێکۆشاون، مێژووی گرتووخانەکانی تورکیش پڕە لە ئیرادەی ئەو چەپە تێکۆشەرانەی بە مەرگیان بوونەتە مایەی مانەوەی کوردبوون لە تورکیادا. ڕۆژ و مانگ و ساڵەکان لە یادەکانیدا پڕن لە ئازارەکانی مووسا عەنتەر و هاوڕێکانی وەکو کەسانی چەپ و گەیشتن بە سۆشیالیزم. ئەم پیاوە ساڵ بە ساڵ تا چووەتە تەمەنەوە، گەورەیی لەوەدابووە کە نەیتوانیوە بۆ یەکجاریش بیر لە شکست بکاتەوە، گرتووخانەیەکی بەدناوی تورک نییە کە مووسا شەوی تێدا ڕۆژ نەکردبێتەوە، لەناو ئەم گیانەدا ڕۆحێک هەبووە هەمیشە بۆ ئازادی تێکۆشاوە، تا ئەو ڕۆژەی بێشەرمانە تیرۆریان کرد سڵی لە مەرگ نەکردووەتەوە. کاتێکیش بیر لەوە دەکەینەوە کە لەم کتێبەوە دەچینە سەر ئەو هەموو ستەم و مەرگەساتانەی دژ بە کوردانی باکوور کراوە، دەبێت لەمەدا زۆربەمان خۆمان بە قەرزارباری ئیرادەی مووسا عەنتەر و هاوڕێکانی بزانین، بە خوێندنەوەی یادەکانی مووسا مرۆڤ دەبێت فێری ئەو ئەخلاقیەتە ببێت کە کوردبوون بە کەسانی وەکو

مووسا عەنتەر دەکرێت نەک کەسانێک کە هەمیشە درۆ دەکەن و خەڵک فریو دەدەن، لە ڕۆحی وشەکانی ئەم پیاوەوە بە کردار و جووڵەکانیەوە ئەو ساتانەمان بەبیر دێتەوە مرۆڤ ئەگەر ویستی بوونی هەبێت دەبێت وەکو مووسا بژی و بمرێت، لە ژیانی مووساوە تێدەگەین بەتەنیا نووسین لە گیانێکی مردوودا هیچ نابەخشێت گەر جووڵە و باوەڕ و ئیرادەی لەگەڵدا نەبوو، مووسا عەنتەر لەو پیاوە بەباوەڕانەبوو کە هەمیشە نەیارەکانی بە بچووکی دەبینی و خۆی لەوپەڕی نەداری و چەوساندنەوەیشدا بە بەهێزی دەردەخست، هیچ هێزێک نەبوو کۆڵ بە باوەڕەکەی بدات و پەشیمانی بکاتەوە.






*بیرەوەرییەکانم، مووسا عەنتەر، وەرگێرانی لە تورکییەوە: محەمەد عزەدین، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای فام بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٢١.



# مووسا عەنتەر و برینا ڕەش

محەمەد ئوزوون( ١)

شانۆنامەی (برینا ڕەش)ی مووسا عەنتەر، لە ساڵی 1965 بڵاو کرایەوە.

ئاپێ مووسا خۆی لە کتێبەکەیدا نووسیویەتی: "ئەو کتێبەم ساڵی 1959، ئەو کاتەی لە زیندانی تاکەکەسیی ژمارە 38ی گرتووخانەی حەربییە، لە ئیستانبوڵ دەستگیر کرابووم، نووسی".

مادەم وایە، با بگەڕێینەوە بۆ ساڵانی پێش نووسینی ئەو کتێبە. لەوێ دەمێدا، سەرجەم شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی کورد لە ساڵانی (1925-1928-1930-1936-1938-1941-1942...) سەرکوت کرابوون. کورد بەرەورووی دەسەڵاتێکی داپڵۆسێنەری هەمەگیر ببوونەوە. لەسەر خاکی کوردان، دووکەڵی ئاگرێکی بەتینی بەردەوام بەری ئاسمانی گرتبوو. ترس و بێباوەڕی و نیگەرانی، لە هەموو شوێنێک، باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشابوو. بە سەدان و هەزاران ڕووناکبیر و کەسایەتیی دیاری کورد کوژران و لەنێو بردران و وڵاتبەدەر کران. زمانی کوردی و هەر شتێکی دیکەی پەیوەندیی بە زمانی کوردییەوە هەبوایە، قەدەغە کرابوو. کوردی قەڵەندەر، خنکاوی دەریای پرسە و شینوشەپۆڕێکی بێ بن بوو. وێرانبوونی نیشتمان و ئەو بارودۆخەی تێی کەوتبوو، کوردی بێچارەی خستبووە دەریای هەژاری و مەرگ و ئەسرین.

لە سەروبەندێکی وەهادا، گوتنی "من کوردم" هەر خۆی لە خۆیدا مەردایەتییەکی زۆر گەورە بوو. مووسا عەنتەریش لەژێر ئەو سیاسەتە داپڵۆسێنەرە قورس و دۆخە گرانانە، شانۆنامەکەی خۆی بە کوردی نووسی. نەخاسمە ئەو کارەیشی لە زیندانێکی سەربازیدا کرد.

دەقە ئەدەبییەکان، لە ڕووی مانا و گرنگییەوە، پەیوەندییەکی تایبەت و بەهێزیان بە سەردەمەکانی خۆیانەوە هەیە. سەردەمی وەها بووە، نووسینی ڕستەیەک، یان نووسینەوەی چەند وشەیەک وەک شۆڕشێک وابووە. بۆیە وەها کارێک بە شەرەفێکی گەورە داندراوە. لە کاتێکدا سەردەمی وەهاش هەبووە، نووسینی چەندان بەرگی کتێبیش هیچ گرنگییان نەبووە.

بۆیە ئەوەی (برینا ڕەش)ی مووسا عەنتەری کردۆتە دەقێکی زۆر گرنگ و نەمری کردووە، تایبەتمەندییەکانی سەردەمی نووسینی ئەو شانۆنامەیەیە. لە سەردەمێکدا کەس نەیدەوێرا بڵێ کوردم و نەدەتواندرا ڕستەیەکیش بە کوردی بنووسرێ، مووسا عەنتەر لەناو زیندانێکی سەربازی لە ئیستانبوڵ، شانۆنامەیەکی کوردیی زۆر مانادار و جوان دەنووسێ.

گەر بە هەڵەدا نەچووبم، (برینا ڕەش) لە دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا لە ساڵی 1923وە، جگە لەو شیعر و داستانە پارچەپارچە و پەرشوبڵاوانەی لەولا و لەملا بڵاو دەبوونەوە، یەکەم کتێبی کوردییە چاپ و بڵاو کرابێتەوە. وەلێ (برینا ڕەش) وەکو کتێب، یەکەم کتێبە کە بە کوردی نووسرا و بڵاو کرایەوە. بەهۆی ئەو تایبەتمەندییەشییەوە، ئەم دەقە، لەناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردی خاوەن پێگەیەکی گرنگە.

لە کولتوور و فەرهەنگ و تەجرەبەی نەتەوە پێشکەوتوو و ڕۆشنبیرەکانی دیکەی دنیادا، دەزانین مرۆڤی ڕووناکبیر ئەو کەسەیە، هەنگاوی نوێ داوێ و ڕێگە ڕۆشن دەکاتەوە و دەبێتە ڕێپیشاندەری گەلەکەی. جا کە ڕێگەیەکی تازەش دەکاتەوە، زانیاری و زانستی لەسەر ئەوە زۆرە، تا چۆن بتوانین بەو ڕێگەیەدا گوزەر بکەین. وەلێ بێ هیچ گومانێک، لە هەمووی بایەخدارتر، کردنەوەی ڕێگەیەکی تازەی دەرچوونە بۆ گەلەکەی.

سەرباری ئەو هەموو تەوژمە نەرێنی و زەحمەتییانەی هەبوون، وەبەرهێنانی دەقی باڵا پێویستییەکی ناچاری بوو. مووسا عەنتەر و (برینا ڕەش) وەک نموونەیەک بەقەد ئەوەی دەقێکی پێویستی ناچارین، ئەوەندەش خاوەن کەرامەت و باڵابەرزین.

مووسا عەنتەر، لە پێشەکیی دەقەکەیدا دەڵێ:

"برینی ڕەش لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات(1)






1 مەبەستی ناوچە کوردییەکانی ناو تورکیایە. (وەرگێڕ).

زۆرن. هەر لە باپشکێو و وەرەم و گولی-یەوە بگرە، تا چەندان نەخۆشیی دیکە؛ لە هەمووشی گرانتر و هەشبەسەرتر، نەزانی و فەقیرییە". جا ئەو شانۆگەرییەی مووسا عەنتەر بۆ ئەو برینە ڕەشانە، وەک دەرمانێکە. جەهالەت و هەژاری، بۆ هەموو گەل و نیشتمانێک، برینێکی ڕەشی سەختە. جا ئەو برینەش، هۆکارێکە بۆ ئەو گەلە تا بەردەوام هێسکی بشکێندرێ و وەک دیل مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و ڕێ لە پێشکەوتنی بگیرێت. دەرمان و چارەسەری هەژاری و جەهالەتیش، شارستانییەت و پەروەردە و خوێندنەوە و نووسین و ڕووناکبیرە ڕێگە ڕۆشنکەرەوەکانین. عەنتەریش بە پشتبەستن بەو بنەمایە، بناغەی سەرەکیی شانۆنامەکەی لەسەر خوێندەواری دارشتووە. وەک چۆن بە زمانێکی ڕەوانی کوردییش، باس لە نەداری و جەهالەتی کۆمەڵگەی کوردی دەکا. گوندی زۆراڤا و ژیانی زینۆ و برۆ و پەیوەندییە خێزانییەکانی کۆمەڵگەی کوردی بێچارە، نموونەکانی ناو شانۆنامەکەینە. لە لایەکی دیکەشەوە، بەدۆی کوڕی زینۆ و برۆ، نموونەی ئەو ڕووناکبیرەیە کە نووسەر ئامانجییەتی بیکاتە کارەکتەری سەرەکیی شانۆنامەکەی. بەدۆی خاوەن کارەکتەری سەرەکیی شانۆنامەکە، ئومێدی داهاتووی گەلی کوردە. بەدۆ، دوای تەواوکردنی خوێندن، دەبێتە دکتۆر و دەست بە پێچانەوەی برینەکانی گەلی کورد دەکات و دەبێتە دەرمانێک بۆ چارەسەری تەواوی برینە ڕەشەکان.

یەکەم جار، ساڵی 1971، مووسا عەنتەرم لە بەندیخانەی سەربازیی دیاربەکر دیت. لەوێ دەمێوە، یەکەم هەست و باندۆر کە مووسا عەنتەر لەسەر من بەجێی هێشت ئەمە بوو "خەم و کەسەر". زۆر بە خۆی و دۆخەکەی دڵتەنگ و بێتاقەت بووم... من لەوێ دەمێدا گەنجێکی تەمەن 18 ساڵان بووم. ئەویش ئاپۆیەکی تەمەن 55 ساڵان. عەنتەر ئەودەمی قژەکانی سپی ببوون. تەمەنی لاوی و ناوەڕاستی تەمەنی جێ هێشتبوو و بەرەو ئیختیاری هەنگاوی دەنا. کاتێک زیاتر و لە نزیکتر ئەوم ناسی، تێگەیشتم زۆر بەهەڵەدا چوومە. چونکە مووسا عەنتەر بە دڵنیاییەوە هۆکاری خەمباربوونی مرۆڤ نەبوو. بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو بەردەوام ئومێد و بەرخۆدانی لە ناخی مرۆڤەکان دەچاند.

مووسا عەنتەر، بە وتە و کارەکتەر و کردارەکانی، ئومێد و بڕوا و گەرمییەکی بە بەندیخانە دەبەخشی. ئەو بەندیخانەیەی دەبوو تژی ترس و دوودڵی و نائومێدی بێ، عەنتەر کردبووی بە شوێنێکی زۆر پێچەوانەی ئەوە. ئیدی زیندان بۆ ئەو ببووە شوێنی پەروەردە و کەیف و خۆشی. گرتووەکان هەر کاتێک بێتاقەت و دڵتەنگ و نائومێد بانە، دەچوونە لای مووسا عەنتەر، ئەویش بە گاڵتە و چیرۆک و گۆرانی و حیکایەت و بەسەرهاتەکانی، هەرچی هەستی تاریک و ناخۆش هەیە لە لای دەرەواندنەوە. چونکە نووسەری (برینا ڕەش) بەردەوام بەدوای ئەو ئامانجانەیدا بوو، کە لەناو شانۆگەرییەکەیدا نووسیویەتییەوە.

(برینا ڕەش)، لەناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا خاوەن پایەیەکی بەرزە. هەوڵ و تەقەلای شانۆنامەکە، چونکە هەوڵی هەستکردن و زانینە بۆ ئەوەی سوودێکی گەورە بە گەلی کورد بگەیەنێت، بۆیە بایەخێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی هەیە. هەموو ئەمانە وا دەکات بڵێین، بە دڵنیاییەوە نابێ مووسا عەنتەر لەبیر بکرێ، بۆ ئەمەش دەبێ بەردەوام کتێبەکانی چاپ بکرێنەوە و بخرێنە بەر دیدی خوێنەران.

سەرچاوە: برینا ڕەش، شانۆگەری، مووسا عەنتەر، لە کورمانجییەوە: محەمەد عزەدین، چاپی یەکەم، دەزگای فام، ٢٠٢٣.

**( ١) محەممەد ئوزوون (١٩٥٣-٢٠٠٧): نووسەر و ڕۆماننووسێکی کوردی، هاونیشتیمانیی باکووری کوردستانە. دامەزرێنەری ڕێکخراوی پێنووسی کوردە لە سوید. خاوەنی زیاتر لە بیست پەرتووکە بە زمانی کوردی و زمانی دیکە. یەکەم ڕۆمانی بە نێوی (تۆ) لە ساڵی ١٩٨٥ بڵاو کردەوە. هەروەها گەلێك لێکۆڵینەوە و هەڵبەستی نووسیوە. جگە لە زمانی کوردی، گەلێك بەرهەمی بە زمانی ئینگلیزی، سویدی و تورکییش نووسیوە. ئەمڕۆ هەندێك لە توێژەران، ئەو وەك سەرکێشی ڕۆمانی کوردیی مۆدێرن دەپەژرێنن و بەرهەمی ئەو لە ڕیزی ئەو بەرهەمانەن کە زۆر دەخوێندرێنەوە. بەهۆی خەبات و نووسین بە زمانی کوردی، چەند جار لە لایەن دەسەڵاتی تورکیا خرایە بەندیخانەوە و هەر بەهۆی ئەم کێشەیەوە، هاوینی ساڵی ١٩٧٧ باکووری کوردستانی بەجێ هێشت و بۆ ساڵانێکی دوورودرێژ لە وڵاتی سوید مایەوە. لە سوید ساڵی ٢٠٠١، خەڵاتی Torgny Segerstedtی سویدی وەرگرت. (وەرگێڕ).**



Piyesa Mûsa Anter dermanê birÎnên reş e. JarÎtÎ û nezanÎ jahreke bê eman e ku dikeve can, ruh û bedenên gel û neteweyan û wan dike dÎl, wan ji hev dixÎne û wan dike şerpeze û pergendeyên ber deriyên serdest û zordaran.

Dermanê jarÎtÎ û nezaniyê ronahiya perwerÎ, şaristanÎ, xwendin û nivisÎn e. NivÎskar piyesa xwe li ser vê daxwaz û armancê ava kiriye. Ew bi zimanê xwe yê xweşik nezanÎ, paşdemayÎn û belengaziya civaka Kurd salix dide. Gundê Zoravê, mala ZÎno û Biro nimûneyên rebeniya civaka Kurd in. Lê li milê din lawê wan Bedo ku qehremanê piyesê ye, ronahÎ ye.

Ew hêviya pêşeroja civaka Kurd e. Ew nimûneyê perwerÎ, xwendin û pêşveçûnê ye. Ew dibe doktor (bijÎşk) û birÎnên mirovên Kurd derman dike.

Ew dibe dermanê birÎnên reş... Gava min Mûsa Anter cara pêşÎn li GirtÎgeha LeşkerÎ ya Diyarbekrê dÎt, 1971, hingê dilê min pê şewitÎ. Ez xortekÎ 18 salÎ, ew apekÎ 55-56 salÎ bû. Porê wÎ spÎ bû, ew li ser riya kalbûnê bû. Lê piştÎ min ew ji nêzik ve nasÎ, min fêm kir ku ez şaş im. Mûsa Anter ne ew mirov bû ku dilê min pê bişewitiya. Berevajiyê wê, bawerÎ dida mirovan. WÎ bi gotin, xebat û tevgera xwe bawerÎ û germahÎ direşand ser girtÎgehê. WÎ girtÎgeh, warê bêhntengÎ û gumanan, kiribû warê kêf û henekan. GirtÎgeh jê re bibû seyrangeh. Gundiyên bêhnteng û bi şik û guman, xwe dispartin wÎ û derd û keser û gumanên xwe bi gotin, henek û şÎretên wÎ derman dikirin. NivÎskarê BirÎna Reş li girtÎgehê jÎ li ser riya armanc û mebesta piyesa xwe bû. BirÎna Reş xwediye cihekÎ pÎroz e. Daxwaz, armanc û mebesta wê pÎroz e. Loma ew divê ji bÎr nebe û car bi car ji nû ve bê weşandin û belavkirin.

Musa anter, brÎna reş, Aram yay□n evi



"BirÎna Reş", piyesa MÛsa Anter di sala 1965'an de weşiya. Di rÛpela duyemin ya pirtÛkê de nivÎskar dibêje: "Min ev pirtÛk sala 1965'an li Stenbolê li Harbiyeyê, di hucra 38'an de dema ku ez girtÎbÛm nivÎsÎbÛ..."

Em wan salan bÎnin bÎra xwe; serhildanên Kurdan (1925, 28, 30, 36, 38, 41, 42...) bi xwÎn hatibÛn şikandin. Mij Û dÛmana şewatê ji welat radibÛ. Tirs, xof Û sawê kirasê xwe rakişandibÛ ser welat. Bi sedan bi hezaran bÎrewer, rênas Û ronakbÎrên Kurd hatibÛn kuştin, ji welêt hatibÛn bidÛrxistin Û dêngê wan hatibÛ birÎn. Zimanê kurdÎ Û her tiştê ku têkiliya wÎ bi kurdÎ Û kurdÎtiyê hebÛ hatibÛ qedexekirin.




Gelê Kurd şÎna xwe girê dabÛ. Welatê xirbe Û kavil digiriya. NeçarÎ, belengazÎ Û bêgaviyê bêhn li mirovên Kurd çikandibÛ.

Di rewşeke wiha kambax de gotina "Ez Kurd im." bi serê xwe gaveke mezin bÛ... MÛsa Anter BirÎna Reş di rewşeke wiha kambax de Û bi ser de jÎ li zindanên eskerÎ nivÎsÎ.

HêjahÎ Û nirxê berhem Û eseran li gorÎ dewr Û deman e. Di hin deman de nivÎsÎna peyvekê an gotinekê bi serê xwe şoreş e, bi rÛmetirÎn tişt e. Di hin deman de jÎ bi cildan pirtÛk nivÎsÎn ne ti tişt e. Tiştê ku berhema MÛsa Anter BirÎna Reş dike nemir Û hêjahiyeke giranbiha didiyê, ew dewr Û dem e. Di wê dewr Û dema kambax de ku kesÎ newêrÎbÛ gotina "Kurd" bi lêv bikira Û rêzekê bi kurdÎ binivÎsa hingê MÛsa Anter piyeseke (şano) hêja bi zimanê kurdÎ nivÎsÎ.

Eger ez ne şaş bim, BirÎna Reş pirtÛka yekemÎn bÛ ku piştÎ damezirandina Komara Tirkiyeyê 1923, bi zimanê kurdÎ dihat nivÎsÎn Û weşandin. Car caran hinek helbest Û çend hevokên bi kurdÎ li hinek deran diweşiyan lê mÎna pirtÛk destpêkê BirÎna Reş bi zimanê kurdÎ ronahÎ didÎt Û cihê xwe yê bi rÛmet di dÎroka pêşveçÛna ziman Û wêjeya kurdÎ de digirt.

Em ji dÎroka tevgerên çandÎ Û ronakbÎrÎ yên neteweyan dizanin ku ronakbÎr Û pêşewa ew kesên gavên nÛ davêjin, rê vedikin Û rê nÎşan didin in. Gava rê vebÛ Û li ber mirovan diyar bÛ, kesên ku xwe bidin ser rê, pir in. Lê hêjatirÎn gav Û kirin ew tişt e ku mirov rê veke. Digel her celeb dijwarÎ Û kêmaniye, mirov bikaribe afirÎn, berhem Û eserên nÛ Û pewÎst bÎne pê... BirÎna Reş Û nivÎskarê wê MÛsa Anter mÎnakên vê yekê ne.

MÛsa Anter di kurte-pêşgotina xwe de dibêje: "Li rojhilatê (Kurdistanê M.U.) birÎnên reş pirin. Wek bÎrova çavan, êşa zirav, kotÎbÛn Û ya ji wan gişa dijwartir Û diya wan, jarÎtÎ Û nezanÎ...